برای خۆشەویست کاک سالە نەڵۆسی
.بە هەزاران سڵاو. ئەوەش www.peshmergekan.com
وەرگێڕاوەی کتێبی (کوندی کوێر).دەستەکانتان بە گەرمی
دەکوشم.

سەرکەوتوو بن.

براتان حامیدڕەشیدی زەرزا.٢٠١٣/١٠/١١ی زایینی.

کتێبی (کوندی کوێر)

نووسەر: سادق هیدایت: وەرگێڕی کوردی: حامید ڕەشیدی زەرزا.

لە ژیاندا گەلێک برینی تەشەنا هەن، کە وەکوو خۆرە لە قولینچکێک، وردە وردە گیان دەکرێنێ و دەخوات. ناکرێ ئەو دەردوو کوللوو ناسۆرانە، لە لای چ کەسێک دەر ببڕێ و بدرکێنی، چونکە لە سەر یەک خەڵک پێیان وایە کە ئەم دردەوو کەسەرانەی باوەڕ پێنەکراو، بەشێک لە ڕوداوو پێشئامەدی بە دەگمەنن و بە عەجایب و جێگای سەر سوڕمانیان دەژمێرن، و ئەگەر کەسێک بڵێت یا بنووسێ،خەڵک بە پێی عادەت و ئاقیدەو بیرو بۆچوونی خۆیان، تێدەکۆشن ئەوی بە پێکەنین و شک و گومان و گەمە و قومار پێدان و بزدان و پاسقالی بە حیساب بێنن، چونکە ئینسان هێشتا چارەو دەرمانی بۆ نەدۆزیوەتەوە و تەنیا دەرمانی وی لە بیر بردنەوەو فەرامۆشی و خۆ لێگێژ و

گێل کردن و پەنا بردن بە مەی و مەیخانەو خەوی
دەستکرد و تریاک و هێرۆئین ماددە هۆشبەرەکانە،
بەڵام بە داخەوە ئەم جۆرە دەواو دەرمانانە چرکەو
چاخ و کاتی وەرزین و لە جیاتی ئارام و تەسکین و
سوکنایی بەخشین، لە دوایی سەر دەمێکی کورت
دەردەکەی کولترو توندو تەشەناترو کۆڵەوارتر دەکات.

ئاخۆ ڕۆژێک دا دێ کە لەو ڕازو نهێنییە کاریانەی تەژی
لە ڕەمزو سەرداپۆشراو و نەدرکاوی ئەو ڕووداوانەی
سروشتی، لەم دەنگدانەوەو زایەڵەی سێبەری گیان،
کە لە نێوان بێهۆشی و بێداری خۆی دەنوێنێ،
کەسێک لێی حاڵێبێ و سەرەدەری لێدەرکات؟

ئەمن تەنیا بە راڤەو شیکردنەوەو ئازەنتی، سەبارەت
بە یەکێک لەو ڕووداوانە داخۆم کە بۆخۆم هاتۆتە پێش
و خۆم لە گەڵی دەست لە ملان و دەست بە یەخە
بووم و بە ڕادەیەک ئەمنی ڕاتڵەکاند کە هیچ کات لە
بیری نابەمەوە، و شوێنپێی نەحس و بەد یوومی وی-
هەتا لە سەر دونیا زیندوم،لە ئەزەل هەتا ئەبەد،
هەتا ئەو جێگایە کە لە دەرەوەی تێگەین و فامین و
ڕێ تێبردنی ئینسانە- ژیانی من زەهراوی دەکات.
ژهراویم نووسی، بەڵام دەمەویست بڵێم دایم و
دەرهەم هەڵگری داخ و دەردی ویم لە گەڵ خۆم
هەبووەو لە گەڵ خۆم دەبێت.

دەجا ئەمن حەولدەدەم هەتا ئەو جێگایە کە لە بیرمە،
ئەو هەی کە لە پەیوەندی ئەو ڕووداوە لە زەینم دا
ماوە بنووسم، بەڵکوو بتوانم لە مەڕ وی داوەریەکی
سەرجەم بکەم، نەک! تەنیا دڵنیابم و یان لە
بنەڕەتدا بۆخۆم بشیم باوەڕ بکەم- چۆنکە بۆ من چ

گرینگایەتی نییە کە ئیدیکە باوربکەن، یان نەکەن. تەنیا خۆف لەمە دەکەم کە سبەی بۆخۆم بمرم و هێشتا خۆم نەناسێبێت. چونکە لە دەورانی ئەو ئەزموونانەی ژیان، تووشی ئەو بابەتە بووم کە چ هەڵدێرێکی ترسەنۆک لە نێوان من و ئەوانیتر بییەو بوونی هەیە،و تێگەیم و فامم کرد،دەجا هەتا بۆم دەلوێ دەبێ بێدەنگ بم و هەتا دەلوێت دەبێ هزری خۆم بۆ خۆم راگرم و ئەگەر ئێستا بڕیارم گرتووە کە بنووسم، تەنیا بۆ وەیە کە خۆم بە سێبەری خۆم بناسێنم- سێبەرێک کە لە سەر دیوار خوار بۆتەوە، وەکوو وەیە کە هەرچی دەینووسم بە حەزو ئیشتایەکی هەر چەند تەواوتر هەڵیدەلووشی و قووتی دەدات-. بۆ وەیە کە دەمەوێ ئەزموونێک بکەم، بزانم بەڵکوو بتوانم یەکتر باشتر بناسین. چونکە لەو کاتەوە کە پەیوەندی خۆم لە گەڵ ئەوانی تر پچڕاندوە، دەمەوێ خۆم باشتر بناسم.

هزرو فکری پۆچ و ناو بەتاڵ! لە هەر ڕاستێیەک زۆرتر ئەمن ئەشکەنجە و جەزرەبە دەدات. ئاخۆ ئەو خەڵکانەی کە وەکوو منن،کە بە ڕەواڵەت پێداویستیەکان و هەواو هەوەسی منیان هەیە، خەرێکی فریودانی من نین؟ ئاخۆ لۆچێک سێبەر نین کە تەنیا بۆ قەشمەرەو گاڵتەو پاسقالی و فریودان و بنکڵیشە و بە هەڵە بردنی من بە وجود هاتوون؟ ئاخۆ ئەوهەی کە هەستی پێدەکەم، دەیبینم و هەڵیدەسەنگێنم، سەرانسەر شێوەیەک خەیاڵاوی نییە، کە لە گەڵ ڕاستی و دورستی زۆری تەوفیر هەیە؟

ئەمـــن تەنیـــا بـــۆ ســـێبەری خـــۆم دەنووســـم کە لە بەر چـــرا، وە دیوار کەوتووە، دەبێ خۆمی پێبناسێنم.

***

لە دونیـــای هـــیچ و پـــۆچ و تەژی و دارمـــاڵ و لێپالیـــپ لە هەژاری و شـــوێنی ژیـــان،بۆ یەکەمـــین کەڕەت، فکـــرم کـــرد کە لە ژیـــانی منـــدا برووســـکەیەکی ڕۆژ درەوشـــاوە، بەڵام بە داخەوە، ئەمە ترووســـکەی خـــۆر نەبـــوو، بەڵکـــوو تەنیـــا تیشـــکێکی تێپەڕیـــو، هەســـارەکی باڵـــدار بـــوو کە بە بیچمـــی ژنێـــک، یـــان فرشـــتەیەک خـــۆی نوانـــد، لە ڕووناکـــایی ئەو چـــرکە، تەنیـــا یەک ســـانیە، هەمـــوو بەدبەختـــی و چـــارە ڕەشـــییەکانی خـــۆم بینـــی و بەگەورەیـــی و عیـــزەت و جەلال و شـــکۆی ویـــم فـــام کـــرد، دوایـــی ئەو تیشـــکە، لە گێـــژاوی بوڵیـــڵ و تاریکـــانی کە دەبـــوو، ون بێـــت، ســـەر لە نـــوێ ون بـــوو. نـــا، نەشـــیام و نەمتـــوانی ئەو ورشـــەو پرشـــنگ و ڕەهـــێڵەیە، بـــۆ خـــۆم ڕاگرم و دەستەمۆ کەم.

ســـێ هەیـــڤ- نـــا- دوو مانـــگ و چـــوار ڕۆژ کە پـــێ شـــوێنی ون بـــووی ویـــم، هەڵگرتبـــوو،بەڵام بیرەڤـــانی چاوەکـــانی ســـێحربازی، یـــان ئاورینـــگ و پریشـــکی ڕەکێشـــی خەمزەکـــانی، لە زیـــوارو ژیـــانی مـــن دایـــم و دەرهەم مـــایەوە. چلـــۆن دەتـــوانم و دەشـــیم ئەوەی فەرامـــۆش کەم و لە بیـــر خـــۆم بەرمەوە، کە ئەوهـــا پەیوەنـــدارو بەستراوە، بە ژیان و ژیواری منە.؟

نا،نـــاوی وی چ کـــات و چـــاخ نـــاهێنم، چـــونکە ئەو ئیـــدی بەو بەژن و بـــالای باریـــک و تەم ئـــاوی،،بەو دوو چـــاوی گەورەو ســـەر ســـوڕهێنەر و ورشـــە دار، کە لە پشـــت ژیـــانی مـــن ســـەبرۆکە بە دەردو خەم و دەســـوژیاو

دەتواوە، ئەو ئیدی پەیوەندی بەم دونیای هیچ و پۆچ و دڕندە نییە. نا،ناوی وی نابێ تێکەڵ و ئاویتە بەو شتانەی سەر گۆی هەرد بکەم.

لە پاش وی ئەمن ئیدی خۆم لە جەرگەی ئینسانەکان، لە جەرگەی گەوجەکان و خۆش شانسەکان بە سەر جەم هێنادەر و بۆ لە بیر بردنەوەی ئەو دەردانە، بۆ مەی و مەیخانەو تریاک و وافورم پەنا برد. ژیانی من تەواوی ڕۆژ لە ناو چوار دیواری هۆدەکەم تێپەڕ دەبوو و دەبێت. سەرانسەری ژیوارم لە نێوان چوار دیوار تێپەڕیوە.

سەرانسەری ڕۆژ سەر گەرمی من نەخش کێشان لە سەر، لاپەڕەی قەڵەمدان بوو. هەموو کاتم بۆیە کاری و شکڵ کێشان لە سەر جلدی قەڵەمدان و خواردنەوەی شەڕاب و ئارەق و کێشانی تریاک دەبوو، کاری گاڵتەی شکڵ کێشان،بۆ ئەوەی خۆم گیژ بکەم، بۆ ئەوەی چاخ بکوژم.

لە جوانچاکی ڕووداو ماڵەکەم لە دەرەوەی شاری،لە ناوچەیەکی کپ و بێدەنگ و ئارام دوور لە ئاژاوەو و هەراو هوریای ژیانی خەڵک هەڵکەوتووە، دەوروپشتی وی، بە تەواوی جیا کراوە، دەوراندەوری کاولە. تەنیا لە لای خەندەک، ماڵەکانی بە قوڕ دورست کراو دیاری دەدا، شار دەست پێدەکات. نازانم ئەو ماڵە، کام شێت یان کام بێسەلیقە لە سەردەمی د قیانووس دورستی کردوە! چاوم کە لە سەر یەک دادەنێم و دەقوچێنم، نەک تەنیا هەموو کونی دەسەمبەکان لە بەر چاوم دەبینم، بەڵکوو تەوژمی ئەوان لە سەر شانی خۆم هەست پیدەکەم. ماڵێک

کە تەنیـــــا لە ســــەر قەڵەمـــــدانەکانی کەونــــارا مـــــومکینە شکڵیان کێشابێت.

دەبـــێ هەمـــوو ئەمـــانە بنووســـم، هەتـــا بـــدێنم کە لە خـــۆم شـــک وگومـــان نەکـــردوە! دەبـــێ هەمـــوو ئەوانە بە خـــڕوو پتـــوونی بـــۆ نیســـێیی خـــۆم، کە کەوتـــۆتە ســـەر دیـــواری شـــیکەمەوە. بەڵـــێ، پێشـــتر لە بـــووم دڵخۆشـــکەریەک، یـــان کـــاکڵی دڵخۆشـــی، وەک گـــوێزی پـــۆچەل لێهـــاتبوو. لە نێـــوان چـــوار دیـــواری هـــۆدەم لە ســـەر لاپەڕەی قەڵەمـــدان شـــکڵم دەکێشـــا و بەم خـــۆ خافڵانـــدنەی پێکەنـــین هێـــنەر، وەخـــت کـــوژیم دەکـــرد. بەڵام دوایـــی ئەوەی کە ئەو دوو چـــاوەم بینـــی، لە پـــاش ئەوەی کە چـــاوم بە وی کەوت،لە بنـــاخەدا مانـــا، و مەفهـــوم و بـــایەخی هەر بـــزوتنەوەو جـــۆلانەوەیەک لە بەر چـــاوم کەوت. بەڵام شـــتێک کە ســـەیرو، شـــتێک کە جێگـــای بـــاوەڕ پێکـــردن نەبـــوو، نـــازانم بـــۆچی مەبەســـتی دانیشـــتنی هەمـــوو شـــکڵ کێشـــانەکانی مـــن، لە ســـەرە تـــاوە جـــۆرە شـــکڵێک بـــووە! دایـــم و دەرهەم دارێکـــی شـــەنگە بـــێم، دەکێشـــا، کە لە بـــن وی پیـــرە پیـــاوەکی پشـــت کـــووڕوو کـــۆم وەکـــوو(مرتـــاض)هندوســـتان عەبـــای لە خـــۆی هاڵانـــدووە، لە ســـەر چینچکـــان دانیشـــتووە، پێچـــی لە ســـەری بەســـتوو، قـــامکی گەورەی دەســـتی چـــۆپەی بە شـــیوەی بلبســـین و واق وڕمـــان لە ســـەر لێـــوی دانـــاوە. لە ڕووو بە ڕووی وی کێژێـــک بە جـــل و بەرگـــی ڕەشـــی داوێـــن درێـــژ، خـــۆی خـــوار کـــردۆتەوە، گـــوڵێکی نیلـــوفەڕ پێشـــکێش بە وی دەکـــات- چـــونکە لە نێـــوانی وان جـــوگەلەیەکی ئـــاو مـــابەینی بـــوو- . ئـــاخۆ ئەمـــن ئەو دانیشـــتنەم پێشـــتر بینـــی بـــوو؟ یـــان لە خەودا بە مـــن ئیلهـــام کـــرا بـــوو؟ نـــازانم، تەنیـــا دەزانـــم هەر چـــێم شـــکل دەکێشـــا، هەمـــووی هەر

ئەو مەجلیس و ئەو مەبەست بوو. دەستم بە بێ ئیرادەی خۆم ئەو نەخش و نیگارانەی دەکێشا، سەیرتر لەمە، بۆ ئەو نەخش کێشانەم کڕیار پەیدا دەبوو،و هەتا بە هۆی مامم لەو جلدە قەڵەمدانانەم، بۆ هندوستان دەنارد، کە دەیفرۆشت و پارەکەی بۆ دەناردم.

لە حاڵێکدا ئەو مەجلیسە لە بۆم دوورو نزیک بە نەزەر دەهات. باشم لە بیر نییە- ئێستا قەزیەکەم هاتەوە بیر- گوتم: دەبێ بیرەوەریەکانی خۆم بنووسم، بەڵام ئەو ڕوداوە دوایی قەوما،چ پەیوەندی بە مەبەست نییە و بە هۆی ئەم ڕووداوە، بە تەواوی لە نەقاشی و شکڵ کێشانم دەست هەڵگرت. دوو هەیڤ پێشتر- نا- دوو مانگ و چوار ڕۆژ لە وی تێدەپەڕێ. سیزدەی نەورۆز بوو. هەموو دانیشتوانی دەرەوەی شاری هێرشیان هێنا بوو، ئەمن پەنجەرەی هۆدەکەم داخستبوو،بۆ ئەوەی بە ئاسوودە شکل کێشی بکەم. نزیکانی ڕۆژ ئاوا بوو، خەریکی شکڵ کێشان بووم،لە ناکاو دەرگا کراوە، مامم هاتە ژوور،یانی بۆخۆی گوتی کە ئەمن مامی تۆم. ئەمن هیچ کات ئەوم نەبیینی بوو- چونکە ئەو لە سەرەتای لاوی بۆ سەفەرێکی دووروو دریژ ڕویبوو- وەک دەیانگوت پاپۆروان بوو،فکرم بۆ چوو ڕەنگە کاری توجارەتی بە من هەبێت، چونکە گوێبیس ببووم کە مامەلەش دەکات.

بە کورتی مامم پیرە مێرێکی پشت کوور بوو، کە پێچی هندی لە دووری سەری هاڵاند بوو،عەبای زەردو کەشکۆڵێک لە سەر شان، سەرو ڕووی بە شاڵگەردن پێچا بوو، بەرۆکی هاوەڵا بوو، سینگی وەک بزن مواوی کوڵکن دەبیندرا. تاڵە مووی ڕدێنی

تەنکی لە بن شاڵگەردن هاتبوو دەر، دەکرا دەنکە دەنکە بژمێردرێ. پێلوەکانی ناسۆرکردوو سوورو لێوەکانی زەردی مەیلەو سوور بوون. وێکچوونێکی دوورو مەزەداری لە گەڵ من هەبوو. وەک ئەوەی کە وێنەی من کەوتبێتە سەر ئاوێنەی شکاو. ئەمن هەمێشە شکلی باوکم لە کن خۆم ئەوها فکر لێدەکردوە. هەر کە لاقی لە ژوور نا، لە قەراخ هۆدە لە سەر چینچکان هەڵتووتەکا. ئەمن کەوتە فکرم کە خواردەمەنیەکی بۆ دورست کەم. چرام هەڵکرد، چوومە هێشخانی تاریکی هودە،لە خڵوەتی چاوم بە هەموو کەلێن و قوژبنی داسووڕاند، هەتا بەڵکوو شتێکی نەرم، باوی ددانی وی، بدۆزمەوە- هەر چەند دەمزانی کە لە ماڵ شتێک نییە، چونکە نە تریاکم مابوو، نە شەڕاب-. لە ناکاو چاوم بە سەرەوەی ڕەفحە کەوت، وەک بە من ئیلهام کرا بێت، بینیم کە شووشەیەکی کچەکەی شەڕابی کەون کە بە ئیرسم پێگەیبوو- گویا بە بۆنەی ڕۆژی لە دایک بوونم ئەو شەڕابەیان دانابوو- لە سەرەوەی رەفحە بوو. ئەمن هیچ کات وەبیری ئەو شەڕابە نەکەوتبووم، هەر بە تەواوی لە بیرم کرد بوو، کە شتێکی ئەوهام لە ماڵ هەیە. بۆ ئەوەی دەستم بە ڕەفحە بگات، کورسیلەیەک لە وێ بوو لە بن پێم دانا، بەڵام چاخێک هاتم دەست بۆ شووشە شەڕابەکە بەرم، لە ناکاو لە کونی لاباجەی هەواخۆری چاوم بە دەرەوە کەوت، بینیم کە لە دەروەی پشت هۆدەکەم، پیرە مێردەکەی پشت دەرپەڕیو،لە بن دارێکی شەنگەبێ دانیشتووە و کێژێکی جوان- نا،فرشتەیەکی ئاسمانی- لە پێش وی ڕاوەستاوە، خۆی خوار کردبۆوە و بە دەستی ڕاستی چەپکە گوڵێکی نیلوفەری سوور پێشکێش بە وی

دەکرد، لە حاڵێکدا کە پیاوە پیرەکە، نێنوکی قامکی
گەورەی دەستی چەپەی دەجووت.

کێژەکە، دورست لە ڕوو بەڕووی من هەڵکەوتبوو،
بەڵام وای دەنواند کە چ ئاگای لە دەوروپشتی خۆی
نەبێت. چاوی لێدە کرد، بێ ئەوی چاوی لێکرد بێ،
زەردە خەنەیەکی بێهۆشانە، بێ ئەوەی بیهەوێ،لە
قەراخ لێوی ویشک ببوو، وەکوو ئەوەی چاوەنواڕی
کەسێکی نەناس بکات. لە وێ بوو کە چاوەکانی بە
سام و هەیبەت و ئەفسونکارو هەڵخەڵەتێن،
خەمەزەکانی کە وەکوو ئەمە بوو کە مرۆڤ، سەر
کۆنەیەکی تاڵ دەدات، چاوەکانی ئاشوفتەو
ئاڵۆز،سەر سورماو، هەڕە شەکەرو، وادە دەری ویم
بینی، تیشکی ژیانی من لە ڕووی ئەو نغڕۆیانەی
ورشە دارو پڕ ماناو تێکەڵ، حەل بوو توواوە. ئەم
ئاوێنەی دڵڕاکێش هەموو سامان و دارونەداری و
هەست و نیستی منی هەتا ئەو جێگایەی کە فکری
بەشەر لێی داماوە دەستە وەستان و عاجزە، بۆ لای
خۆی ڕاکێشا. چاوەکانی شیرین خێلی تورکمەنی،
ورشەو ڕووناکایی و حیکمەتی ئیلاهی و مەست
هێنەری بوو. لە حاڵێکدا کە دەیترساند و ڕایدەکێشا و
ڕەکێشی دەکرد، کۆی تەماشاگەکانی ترسەنۆک
و(ماورای طبیعی) بینی بوو، کە هەر کەس
نەیدەتوانی بیبینێ. کوڵمەکانی دەرپەڕیوو، نیو
چاوانی بەرز، برۆی باریک پێکەوە نوساو
پەیوەست،لێوەکانی بە گۆشت و نیوە کراوە،
دەمەکەی وەکوو ئەمە بوو کە تازە لە ماچێکی گەرم و
دوورو درێژ جیا بۆتەوە، بەڵام هێشتا تێر نەبووە. تاڵە
مووەکانی ئاڵۆزو ڕەش و ناڕێک و پێک، دەوری

روخســــاری مــــانگە شــــەوی گرتبــــوو، خەرمــــانەی دابــــوو، زنجیــــرەیەک لە وی بە لاجــــانگی وەنووســــا بــــوو. جــــوانی و لەتیفــــی و نــــازەنینی ئەنــــدامەکانی، و بە هێنــــد نەگــــرتن، نێشــــــــانەیەک لە شــــــــێوەو تەرزی ئەداو ئەتــــــــواری و جــــــۆلانەوەی لە بێهێــــــزی و هەشــــــکەلی و ئامــــــانەتیی بــــوونی وی حیکــــایەت دەکــــرد. تەنیــــا و تەنیــــا کێژێکــــی ســــەماکەری بــــوتکەدەی هنــــد لەوانە بــــوو جــــۆلانەوی ڕیکووپێک و بە کێش و هەڵسەنگاوی وی هەبێت.

حــــــــالاتێکی خەمگــــــــین و پلمەژیــــــــاک و شــــــــادی خەمــــــاویەکەی، هەمــــــوو ئەوانە بە تێکڕایــــــی نیشــــــانیان دەدا کە ئەو وەکــــــوو ئینســــــانەکانی ئاســــــایی نیــــــیە. لە بنەڕەتــــــدا جــــــوانییەکەی ئاســــــایی نەبــــــوو. ئەو وەکــــــوو تەماشــــــاگەیەکی خەیــــــاڵی ئەفیــــــونی جلــــــوەی جــــــوانی بە مــــــن دەفرۆشــــــت...ئەو هەمــــــان جــــــوولانەوەی ئەویــــــن و مــــــوحیبەتی گیــــــانی لە منــــــدا وەدیهێنــــــا. بەژن و بــــــالایەکی نــــــازک و تەنــــــک و بەرز بە خەتێکــــــی لە بــــــار و لێهــــــاتوو ڕێکەوتــــــــــــوو کە لە شــــــــــــانی، باســــــــــــکی، مەمکەکانی،سینگی،ســــــمتی بەلەکــــــی پڕێەکــــــانی بەرەو خــــوارو دەچوو،ئەوهــــا بــــوو، وەکــــوو کە لەشــــی ئەویــــان لە باوەشــــی دەســــگیرانی هێنــــابێتە دەر،وەکــــوو "بــــلادانە" بــــوو کە لە ئــــامێزی پــــێکەوە لکــــاو جیایــــان کــــرد بێــــتەوە. جــــل و بەرگێکــــی بە پــــزووی لە بەر کــــرد بــــوو، کە وەک قالــــب یەک بە ئەنــــدام و لەش و بەژن و بــــالای بــــوو. چاخێــــک کە ئەمــــن لــــێم ڕوانــــی گۆیــــا دەیەویســــت لەو جــــۆگەلەی کە لە نێــــوان وی و پیــــرە مێــــر مــــابەینی هەبــــوو بپەڕێــــتەوە، بەڵام نەیتــــوانی. ئەو کــــات پێــــرە مێــــر دەســــتی بە پێکەنــــین کــــرد. پێکەنینێکــــی ویشــــک و بێحوڕمەتــــانە بــــوو، کە مــــووی لە لەشــــی مــــرۆڤ قیــــت دەکــــردەوە. پێکەنێنیکــــی بەرهەڵــــلاو

پڕ لە قەشمەری، بێ ئەوەی ڕوخساری گۆڕانکاری بە سەردا بێت. وەکوو دەنگدانەوەی پێکەنینێک بوو لە نێوان دوو گەڵی بێتە دەرەو ئاوازە بداتەوە.

ئەمن لە حاڵێکدا کە شووشەی شەڕابم لە دەست دابوو بازرەقەو سامم ڕێنیشتبوو، لە سەر کورسیلە هاتمە خوار. نازانم بۆچ دەلەرزیم. لەرزینێکی پڕ لە ترس و کەیف بوو. وەکوو وەی لە خەوەکی شیرین و ترسەنۆک ڕاپەڕیبم. شووشەی شەڕابم لە هەرد دانا، سەرم لە ناو دوو دەستی خۆم گرت. چەند چرکە، چەند کاتژمێری کێشا؟ نازانم. کاتێک وەخۆ هاتمەوە، شووشەی شەڕابم هەڵگرت، چوومە هۆدە، بینیم مامم ڕۆیوە، لایەکی دەرکەی هۆدەی وەکوو زاری مردوو هاوەڵا کردۆتەوە. بەڵام دەنگی پێکەنینی ویشکی پیرەمێر، هێشتا لە بن گوێچکەم دەزرینگاوە.

هەواو بان تاریک دەبوو،چرا دووکەڵی دەکرد، بەڵام لەرزینەکەم، چلۆنایەتی و ترسەنۆکیم لە خۆمدا هەست پێکرد بوو، هێشتا شوێنتێکەری ما بوو. ژیانی من لەو چرکە گۆڕانکاری بە سەرداهات. چاو لێکردنێک بەس بوو، بۆ وەی ئەو فرشتەی ئاسمانی،ئەو کیژی مەلەکووتی هەتا ئەو جێگایەی کە فامینی بەشەر، حێجز لە تێگەینی ئەوە، کارتێکەری خۆی لە من دادەنا.

لەو چاخدا لە خۆم بێخەبەر ببووم،وەکوو ئەوەی کە ئەمن ناوی ویم پێشتر دەزانی. ئاورینگ و پریشکی چاوەکانی، ڕەنگی، بۆنی، بزووتنەوەی، هەموو بە بۆچوونی من ناسیاگ ئامناس دەهات. وەکوو وەی گیانی من لە ژیانی ڕابردووی وی لە دونیا لە گەل

گیانی وی جینارو هاوسێ بووە، ڕیس و گلۆلەی کرێک بووە،ماشەرێک بوو لە سەر تەونێک و دەبێ پێکەوە بلکێنەوە. دەبوایە لەو ژیانە نزیک وی ببوام. هیچ کات نەمدەویست دستنوێژم لێی بشکێت، تەنیا ورشەیەکی نەدیتراو کە لە لەشی ئێمە دەهاتە دەر، پێکەوە تێکەڵ و ئاویتە دەبوو بەس بوو. ئەو ڕووداوی پڕ مەترسی کە بۆ یەکەمین لێڕوانین بە بۆچوونی من ئامناس هات. ئاخۆ دایم و دەرهەم دوو کەسی ئەویندار ئەو هەستەیان نابێت کە پێشتر یەکتریان بینیوە، کە پەیوەندییەکی پڕ لە ڕەمزو نهێنی لە نێوان ئەواندا بوونی هەبووە؟

لەم دونیا هیچ و پۆچ و بێخەبەرە، یان ئەوینی ویم دەویست، یان ئەوینی هیچ کەسێک. ئاخۆ مومکین بوو کەسێکی دیکە لە مندا کارتێکەر بێت؟ بەڵام پێکەنینی ویشک و بێحورمەتانەی پێرە مێر،ئەو پێکەنێنەی خزمەتکار- پەیوەندی نێوان ئێمەی لە بەر یەک هەڵپچڕی.

سەرانسەری شەو لە فکر دابووم. چەند جار ویستم بچم لە کونی دیوار چاوی لێکەم، بەڵام لە دەنگی پێکەنینی پیاوە پیرە، دەترسام. ڕۆژی دواتر هەر لەو فکرە دابووم. ئاخۆ دەمتوانی لە دیداری بە تەواوی و یەکجارەکی چاو بپۆشم؟ لە ئاکامدا سبحەی ئەو ڕۆژی،بە هەزار خۆف و ترس دڵهورە، بڕیارم گرت، شووشە شەڕابکە سەر لە نوێ لە شوێنی خۆی دانێمەوە. بەڵام چاخێک پەردەی پێش سندوخانەکەم لادا و لێم ڕوانی، دیوارێکی ڕەشی تارێک،وەکوو هەموو بولێڵ و تاریکانێک، کە سەرانسەری ژیانی منی داگرتبوو، لە پیش من بوو. هەر لە بنیات را چ

کونێک، کولاوکەیەک، و لاباجەیەک، بۆ دەرەوە لە دیوار نەکرابوو و نەدەدیترا. دریچەی چوار قولینچکی گۆشەی دیوار بە تەواوی قایم و بێ شوێن و نیشان بوو. دەتگوت هەر لە سەرەتا کون و کوڵاوکەیەک وجودی نەبووە. سەندەڵیم هێنا پێش، بەڵام هەر چەند شێتانە مستم لە لەشی دیوار دەداو گوێچکەم هەڵدەخست، یان لە بەر شەبەقی چرا لێم دەڕوانی، نیشانەیەکەم لە کولاوکە، لە دیواردا نەدەبینی،و زەبری مستی من لە دیواری پتەو قایم کارتێکەر نەبوو. یەکجارەکی ببوو بە قوڕقوشم.

ئاخۆ دەمتوانی یەکجارەکی چاوی لێداپۆشم؟ بەڵام بە دەستی خۆم نەبوو. لەمە بەدوا وەکوو گیانێک کە لە ژێر ئەشکەنجەو جەزرەبەدا بێت،هەر چەند چاوەڕوانیم دەکرد، هەر چەند کێشکم لێدەکێشا،هەر چەند بە دوایدا دەچووم کەلک و فایدەی نەبوو. هەموو دەوروپشت و قەراخ و قوجاخی ماڵی خۆمان شیش کوت کردووگەڕام، نەک هەر ڕۆژێک،نەک دوو ڕۆژ، بەڵکوو دوو مانگ و چوار ڕۆژ،وەکوو کەسێک، خوێنێک کە بۆ شوێنی جینایەتی خۆی دەگەڕێتەوە، هەموو ڕۆژێ لای ڕۆژ ئاوا وەکوو مریشکی سەر هەڵقەنیو، بە دورەی ماڵەکەمدا دەگەڕام،بە شێوەیەک کە هەموو بەردەکان و هەموو خیزو ڕەڵمی دەورو پشتی ویم دەناسی. بەڵام چ شوێنەواریک لە داری شەنگەبێ نەبوو،لە جۆگەلەی ئاو و لە کەسانێک کە لە وێ بینی بووم وەدەست نەهات. ئەو هێندە شەوانە، شەوەکانی مانگە شەو، لە بەر شەبەقی مانگ، چۆکەم لە سەر هەرد دادا، لە دارەکان ،لە بەردەکان، لە هەیف- کە ڕەنگە ئەو چاوی

لە هەیـــــڤ نەکــــرد بێـــــت- بە پــــاڕانەو لالانەوە بە گریـــــان و فرمێســــک هەڵوەرانــــدن هەمــــوو زینــــدەواری ســــەر گـــۆی هەردم بە یـــــارمەتی بانگهیشـــــتن کــــرد، بەڵام کەمتــــرین شــــــوێنپێیەکەم لە وی نەبینــــی. لە بنیـــــات را تــــێگەیم کە هەمــــوو کارەکــــانم لە خـــۆرایی و بیهــــودەو چــــونەن، چــــونکە ئەو نەیـــــدەتوانی بەو شـــــتانەی ئەو دونیـــــایە پەیوەنـــــدی و بەســــــتراوەیی هەبێــــت. بــــۆ نمــــوونە، ئەو ئـــــاوەی کە ئەو کەزیەکــــانی پــــیێ دەشووشـــــت، دەبـــــوایە لە کــــانیەکی تــــــایبەت بە کەســـــینی، نەنـــــاس و یـــــــان غـــــــارێکی ســــــێحرئاوای بــــــوایە. جــــل و بەرگــــــی وی لە ڕایەڵــــــوو تێـــــوەدانی ئاوریشــــــم و لـــــۆکەی ئاســــــایی، دەســــــتەکانی ماتریالیســـــم، دەســـــتەکانی بنــــی ئـــــادەم ئەوی نەدروە بــــوو. ئەو یەک بـــــیەی هەڵبــــژاردە بــــوو. تیگەیشـــــتم کە ئەو گـــــوڵانەی نیلــــوفەڕ ئاســـــایی نەبــــوونە. دڵنیـــــا بــــــووم ئەگەر ئەو ئـــــاوی ئاســـــایی لە چروچــــــاوی دابــــــوایە، ڕوخســــــاری وەک میــــــوەی ڕزیــــــو دەگنخـــــا،ئەگەر بە قامکەکـــــانی بەرزو ناســــک و زەریفــــی گــــوڵی نەیلــــوفەڕی ئاســــایی چنــــی بــــوایە، قامکەکـــــانی وەکــــوو گەڵای گـــــوڵ ســــیس و کــــــز دەبــــوون و هەڵـــــدەوەرین. هەمــــوو ئەوانــــم زانــــین و فــــام کرد.

ئەو کیــــژە- نــــا، ئەو فرشــــــتەیە- بـــــۆ مــــن ســـــەرینچاوو، بنــــاوانی ســــەر ســــوڕمان و ئیلهــــامی نەگــــوتراو بــــوو. بیەیـــی جــــــوان و تەنــــک و ناســــک و نەرمــــــوو نــــوڵ و دەســـــــت لێـــــنەدراو ســــــەر بە مـــــۆر بــــوو. ئەو بــــوو کە هەســــــتی پەرســــتنی لە منـــدا پێگەیانـــدو بە بـــار هێنــــاو ئیجـــاد کـــرد. ئەمــــن دڵنیــــام کە لێڕوانینــــی کەســــێکی بیانی،کەســــێکی ئاســــــایی، ئەوی دەشــــــەمزاندو دەچرژانــــــــد و بە خــــــۆدا دەشـــــکاندەوە. لەو چـــــــاخەوە کە ئەوم بــــــزر کــــــردوە،لەو

کاتەوە کە دیوارێکی قایم و پتەو، سەددیکی نمدار بێ کولاوکە بە قورسی قورقوشم لە پێش ئەمن و ئەو کێشرا، هەستم پێکرد کە ژیوارم بۆ هەمێشە لە خۆڕایی و بزر بووە. هەر چەند دڵدانەوەو لاواندنەوەی چاوی لێڕوانین و کەیف و حەزی قووڵ، کە لە بەیینی برد بووم، یەک لایەنە بوو پەرسف و ورامێکی بۆ من نەبوو- چونکە ئەو ئەمنی نەبینی بوو- بەڵام ئەمن ئاتاجێم بەو چاوانە هەبوو، تەنیا سیلە لێڕونێنێکی وی بەس بوو، کە هەموو ئاڕووشەی فەلسەفی و تشتەنۆک و چمامکەکانی ئیلاهیم بۆ حەل کات و هەڵدات. بە چاو لێکردنێکی وی ئیدی ڕەمزو سڕیاتێک بۆ من نەدەماوەو بییەی نەبووبێ.

لەمە بە دوا بە شەڕاب و ترياکی ڕۆژانەی خۆم زێدە کرد. بەڵام بە داخەوە! لە جیاتی ئەو دەرمانانە، هومیدی هزری من ئیفلیج و بێهەست بکات و بتەزینێ، لە جیاتی ئەوی لە بیری بەرم؟ ڕۆژ بە ڕۆژ، چرکە بە چرکە، دەقیقە بە دەقیقە،ساعەت بە ساعەت،فکری وی،لەش و بەژن وباڵای وی، ڕوخسارو چڕو چاوو جەستەی وی، زۆر توندتر و قورستر دەخستە بەر چاوم. چلۆن دەشیام لە بیری بکەم؟ چاوەکانم کە کراوە بوون، یان لە سەر یەکم دادەنان،لە خەو بێداری، ئەو لە بەر چاوی من بوو. لە نێوان کۆلاوکەی سندۆخانەی هودەم، وەکوو شەوێک کە فکرو مەنتیق دەورەی خەڵکی گرتبوو،لە نێوان کونێکی چوار قولینچک کە بە دیوی دەرەوەدا دەکراوە، دایم و دەرهەم لە بەر چاوم بوو. ئیستڕاحەت و ئاسودەیی لە من حەرام ببوو. چلۆن دەمتوانی بحەسێمەوە؟ هەموو ڕۆژی لای ڕۆژ ئاوا لێم ببوو

عادەت پیاسە بکەم. نازانم بۆچی دەمەویست و پێم لە سەر دەقرساند کە جۆگەلەی ئاو،داری شەنگەبێ،لکی داری نەیلوفەڕ بدۆزمەوە؟ هەر وەک بە تریاک ئالودە ببووم، هەر بەمجۆری کە بە گەڕان ئالوودە ببووم، وەکوو وەی بوو کە هێزیکی نەدیتراو ئەمن بۆ ئەو کارە دنە دەداو ڕەکێش دەکات وپاڵ پێوەدەنێت. دەمەویست ئەو شوێنەی کە ڕۆژی سێزدەبەدەر ئەوم لێ بینی بوو، بدۆزمەوە. ئەگەر ئەو شوینم دۆزیبواوە، ئەگەر دەمتوانی لە بن ئەو داری شەنگەبی دانیشم،بیگومان لە ژیانی من حەسانەوەیەک وەدی دەهات. بەڵام بە داخەوە جگە لە داروشکەو پووش و پڵاش و خیزی گەرم، هێسکی پەراسوی ئەسب،سەگێک کە لە ناو تۆزوخۆل بۆنی دەکرد، شتێکی دیکە نەبوو. ئاخۆ ئەمن بە ڕاستی لە گەڵ وی ئاخافتبووم؟ هیچ کات هەر گێز! تەنیا ئەوم بە دزی و بە نهێنی لە کونێک،لە کولاوکەی چارە ڕەشی خلوەتی هۆدەکەم بینی بوو. وەکوو سەگێکی برسی کە لە ناو زبڵوو زاڵوو کۆ پەین و گەند، بۆن دەکات و بە دوایدا دەگەڕێت. بەڵام کاتێک لە دوور زنبیل دینن، لە ترسان خۆی دەشارێتەوە، دوایی دەگەڕیتەوە، وەرکەکانی تامخۆشی لە ناو ئەو گەندو چەتوو چاڵە بدۆزێتەوە. ئەمن ئەو حاڵم هەبوو، بەڵام ئەو کونە گیرا بوو قوڕدادرا بوو. بۆ من ئەو چەپکە گوڵێکی تەڕوو تازە بوو کە فڕیدرابێتە سەر پووش و پەڵاش.

شەوی دوایین،کە وەکوو هەر شەوێک بۆ پیاسە چووم، ئاسمان بارانی بوو، تەپوو مژێکی توند دەورو بەری گرتبوو. لە ئاوو هەوای بارانیدا کە لە پیس و

بێزەلەتی و ناحەزی ڕەنگەکان و بێحەیایی خەتەکانی پرۆپێتاڵ کەم دەکاتەوە، ئەمن جۆرە ئازادیەکەم هەست پێدەکرد، وەکوو وەی بوو کە باران هەزری بولێلی منی دەشووشتەوە. لەو شەودا ئەوهەی کە نەدەبوایە، ببوا، بوو. ئەمن بێ ئەوی بمهەوێ پیاسەم دەکرد. بەڵام لەم کاتژمێری تاق و تەنیایی، لەم چرکانەی کە زەمانی ویم بە دورستی لە بیر نایێتەوە، زۆر توندتر لە هەمێشە ڕوخساری جەفڵ و ترسم ڕێنیشتبوو، شوێن سڕینەوەی وی وەکوو وەی لە پشت هەورو دووکەڵ وەدەرکەوتبێت، چروچاوێکی بێ جۆڵانەوە و بێهێزو بێحاڵ، وەک شکڵەکانی سەر جلدی قەڵەمدان لە بەر چاوم ڕاوستا بوو.

کاتێک گەڕامەوە فکر دەکەم بەتڵێک لە شەو تێپەڕیبوو، تەم و مژێکی زۆر لە ئاسمان و هەرد بڵاو ببۆوە، بە جۆرێک کە بە باشی بەری پێی خۆم نەدەبینی. بەڵام لە ڕووی عادەت،لە ڕووی هەستێکی تایبەت کە لە مندا وەخەبەر هاتبوو، وختێک خۆم گەیاندەوە پێش دەرگای ماڵ، هەیکەلێکی ڕەشپۆش، هەیکەلی ژنێک لە سەر سکۆی ماڵەکەمان دانیشتبوو.

شەمچەم هەڵکرد کە لە بەر شەبەقی وی شوێنی ئاچەری قفڵی دەرگا بدۆزمەوە، بەڵام نازانم بۆچ بێ ئیرادە چاوم قەڵافەتێکی ڕەشپۆشی پێکا! و دوو چاوی ڕەش کە لە ناو ڕوخسارێکی مانگە شەوی لاواز بوو، هەر ئەو چاوانەی کە لە ڕوخساری ئینسان دڕوانی، بێ ئەوەی بڕوانێت ناسیم. ئەگەر ئەوم پێشتر نەبینی بوایە، دەمناسی. نا،فریووم نەخوارد بوو. ئەو هەیکەلی ڕەشپۆش ئەو بوو. ئەمن وەکوو

کەسێک کە خەون دەبینێت و بۆخۆی دەزانێ کە خەوی دیوە و دەیهەوێ وەخەبەر بێت، بەڵام ناتوانێ. مات و تاساو ڕاوەستام، لە جێگەی خۆم ویشک بووم. شقارتە هەتا بنەکەی سوتا، قامکەکانمی سوتاند، ئەوکات لە ناکاو وەخۆ هاتمەوە، ئاچەرم لە قفڵ داسووراند،دەرگا کراوە، خۆم بۆ قەراخ کێشاوە. ئەو وەک کەسێک کە ڕێگا بەڵەد بێت لە سەرکوەکە، هەستاوە،لە داڵانی تاریک تێپەڕی، دەرگای هۆدی کردەوە،ئەمن بە دوای ویدا لاقم لە هۆدە نا. دەست و پێم ون کردن چرام هەڵکرد، بینیم کە ئەو لە سەر نوێن و بانی من ڕاکشا بوو. ڕوخساری کەوتبوو بەر سێبەر. نەمدەزانی کە ئەو ئەمن دەبێنیت یان نا! دەیتوانی دەنگم ببیسێت یان نا!؟؟ بە ڕەواڵەت نە شیوەی ترسی هەبوو نە خۆڕاگری. وەک وەی بوو کە بێ ئیرادە هاتبوو.

ئاخۆ بیمار بوو؟ ڕێگای ون کرد بوو؟ یان بۆ نوستن هاتبوو. لەم چرکەیەدا هیچ گیان لەبەرێک، حاڵاتێکی کە ئەمن تێمپەڕاند ناتوانی فکری لێبکاتەوەو لە زەینی دا بگووڕێ. جۆرە چێژوو هەستێکی خۆش و نەگوراوم هەست پێکرد. نا، فریووم نەخوارد بوو. ئەمە هەر ئەو کێژ بوو،هەر ئەو کێژەی کە بی سەر سورمان، بێ دەربڕینی هەتا تاقە وشەیەک، واردی هۆدەی من ببوو. دایم و دەرهەم لە پاڵخۆمدا فکرم دەکرد، یەکەمین گەپچانی ئێمە ئەوها بەمجۆرە دەبێت. ئەم حاڵاتە بۆ من وەکوو خەونێکی قووڵ و دوروو درێژو بێ ئینتیهاو بێدوایی هاتن بوو- چونکە دەبێ خەوێکی گران و دوروو درێژت وەێبکەوێ، هەتا خەونێکی ئەوها بدینی- و ئەم بیدەنگییە بۆ من

حوکمی ژیانێکی ئەبەدی هەبوو،چونکە لە حاڵاتی
بێدەستپێک و بێسەرەتا، ناکری قسە بکەی.

بۆ من ئەو لە عەینی حاڵدا ژنێک بوو، شتێکی
باڵادەستی بەشەری پێبوو. دەموو چاوی،
فرامۆشیەکی پرووزکاو حەپەساو هەموو روخساری
ئینسانەکانی دیکەی بۆ من دەهێنا،بە جورێک کە لە
تەماشاکردنی وی هەموو لەشم دەلەرزی و
چۆکەکانم شل و بێهێزو بوون. لەم چرکە دا هەموو
بیرەوەریەکانی خەماوی ژیانی خۆم، لە پشت
چاوەکانی گەورە، ئەو چاوانەی لە ڕادە بەدەر گەورەی
وی بینی، چاوەکانی تەڕو برووسکەدار، وەکوو گۆی
ئەڵماسێکی ڕەش، کە لە فرمێسکیان هاویشتبێ. لە
چاوەکانی،لە غەمزەکانی ڕەشی، شەوی ئەبەدی و
ئەو تاریکاییەی کەڵەکە کراو دەگەڕام دۆزیبۆمەوە، و
لە ڕەشایی ترسەنۆک و بە سام عیشوەگەر وی نوقم
بووم. وەکوو ئەمە بوو کە هێزێک لە ناخی دەرونم
دەردەکێشن. هەرد لە بن پێم ڕادەژا، و ئەگەر
کەوتبوامە خوار کەیفێکی نەگوتراوم کرد بوو.

دڵم ڕاوەستا، پێشی هەناسەی خۆم گرت، دەترسام
پشوو هەڵکێشم و ئەو وەکوو هەور، یان دووکەڵ، ون
بێت. بیدەنگی وی حوکمی موجیزەی هەبوو. وەکوو
ئەمە بوو کە دیوارێکی بلوریان لە نێوان ئێمە کێشا
بوو. لەم چرکە ، لەم کاتژمێرە و هەتا هەتایی خەفە
دەبووم. چاوەکانی ،ماندووی وی، وەکوو ئەمە کە
شتێکی ناسروشتی کە هەموو کەس ناتوانی
ببینێت، وەکوو ئەمە مردنی بینیبێت، لە سەرەخۆ

وسەبرۆکە، خەو بردی، پێڵوی چاوەکانی کەوتنە سەر یەک و گاڵە دران،و ئەمن وەکوو قوم بوو، نغرو بووەک، کە لە دوایی تەقەلا کردن و گیان دان وەسەر ئاو دەکەوێت، لە توندو تیژی نۆبەتە و گەندەتا هەڵدەلەرزیم بە سەری کراسم ئارەقەی نێو چاوانم ئەستڕیەوە.

ڕوخساری وی هەر ئەو حاڵاتی ئارام و بێ جوڵەی هەبوو،بەڵام وەکوو وەی بوو کە کز ترو لاواز تر بووە. هەر وا ڕاکشا بوو، نێنوکی گەورەی دەستی چەپەی دەجووت،ڕەنگی چڕوچاوی، مانگەشەو، لە پشت جلو بەرگێکی ناسک کە کیپ بە لەشی بوو، زندو بەلەکی، قاچی،باسکی و دوولای سینگ و تەواوی ئەندامی دەبیندرا.

بۆ ئەوی ئەوی باشتر ببینم، ئەمن داهاتمەوە،چونکە چاوەکانی لە سەر یەک دانا بوو. بەڵام هەر چەند چاوم لە دەمووچاوی کرد، وەک ئەمە بوو کە ئەو لە من بە تەواوی دوورە. لە ناکاو هەستم کرد کە ئەمن بە هیچ شێوەیەک لە نهێنەکانی دڵی خەبەردار نبووم وچ پەیوەندییەک لە مابەینی ئێمە وجودی نییە. ویستم شتێک بڵێم، بەڵام ترسام کە گوێی وی، گوێچکەی بە هەستی وی، کە دەبی بە موسیقایەکی دووری ئاسمانی و ئارام عادەتی گرتبێ، لە دەنگی من بێزار و جارز ببێت. بە فکرم داهات کە لەوانەیە برسی یان تێنوو بێت! چووم سندوخانەی هۆدەکەم، هەتا شتێکی بۆ پەیدا بکەم، ئەگەر چی دەمزانی کە هیچ شتێکمان لە ماڵدا نییە. بەڵام وەکوو وەی کە بە من ئیلهام کرابێ لە سەرەوەی ڕەفحە شوشە شەڕابێکی کۆن کە لە

باوکم بۆم بە ئیرس ماوەتەوە، هەیە. وەسەر چوارپایە کەوتم و هێنامە خوار،بە پێدزە بۆ جێووبان چووم،بینیم وەکوو منداڵێکی ماندوو مردوو خەوی ویکەوتبوو. ئەو بە تەواوی نوستبوو، مژوڵەکانی درێژی وەکوو مەخمەر کەوتبوونە سەر یەک. سەری شووشەی شەڕابەکەم هەڵگرت و پیاڵە شەڕابەکەم لە لای ددانی کلیل کراوی، لە سەرە خۆ لە زاری کرد.

بۆ یەکەمین کەڕەت لە ژیانمدا هەستم بە ئارامبوونێکی کتوپڕکرد بوو. چونکە بینییم کە ئەم چاوانە کەوتوونە سەر یەک، وەک وەی کە ئەشکەنجەگەر ئەمنی ئەشکەنجە دەکرد و کاموسێک بە چنچڕۆکەکانی ئاسنین، دەروونی منی ڕیکدەکوشی، قیچێک ئارام بوومەوە. کورسیلەی خۆم هێنا،لە قەراخ تەختی ویم دانا و مەحوی تەماشای جەماڵی وی بووم. چ ڕوخسارەکی منداڵانە و زارۆکانە، چ حاڵاتێکی سەیر! ئاخۆ ئیمکانی هەبوو کە ئەم ژنکە، ئەم کیژە، یان ئەم فرشتەی عەزاب- چونکە نەمدەزانی چ ناوێکی لە سەر دانێم- ئاخۆ مومکین بوو کە ئەو زیواری دوو لایەنی هەبێ؟ ئەوها ئارام، ئەوها بێ زەحمەت وەبەرخۆدان؟

ئێستا دەمتوانی گەرمایی لەشی هەست پێبکەم و بۆنی نمدار کە لە گزیەکانی قورسی ڕەشی بۆ سەرێ هەڵدەکشا، بۆن بکەم. نازانم بۆچی دەستی لەرزۆکی خۆم بڵند کرد- چونکە دەستم لە ئیختیاری خۆمدا نەبوو- بە سەر زولفی ویمدا هێنا؟ زولفێک کە هەمیشە بە لاجانگی لکا بوو. دوایی قامکەکانم بۆ ناو کزیەکانی برد. تاڵە مووەکانی وی ساردو بۆگڕنیان لێدەهات، بۆنی ڕتوو بەت،بۆنی سارد. بە تەواوی

سارد. وەکوو وەی بوو کە چەند ڕۆژێکە مردووە. ئەمن بە هەڵە نەچوو بووم، ئەو مرد بوو. دەستم لە ناو سینگ و مەمکی برد لە سەر قەڵبم دانا. لە لێدان کەوتبوو. ئاوێنەم هێنا لە بەر دەم و کەپۆم راگرت، بەڵام کەمترین شوێنەواری زیندو بوونی لە ویدا نیشان نەدا.

ویستم بە گەرمای لەشم ئەوی گەرم کەمەوە،گەرمای لەشی خۆمی بدەمێ و ساردی مەرگی لێوەرگرمەوە، بەڵکوو بەو جۆرە بتوانم گیانی خۆم لە لەشی وی باوێژم. جل و بەرگەم داکەند،چوومە سەر تەختخواب لە قەراخ وی راکشام. وەکوو نێرومێینەی گیا پێکەوە وەنووسا بووین. لە حەسڵدا ئەو وەکوو مێینەی بلادانەی بوو کە لە نێرینەی خۆیان جیا کردبێتەوە و ئەو ئەوینی "بلادانەی" هەبوو. زاری وەک میوەی کاڵی تاڵ تامی مزەی هارویی دەدا. تەواوی لەشی وەکوو گلێرە و تەرزۆکە، تەیرۆک،گژلۆگ وگشک، سارد ببوو. هەستم پیدەکرد کە خوێن لە دەمارەکانم دەبەستێ و ئەو ساردو سڕیی و سەرما، هەتا بنەبانی قەلبم کار تێکەر بوو. هەموو حەولوو تەقەلاو تێکۆشانی من بێهودەو بە خۆرایی بوو. لە تەخت هاتمە خوار، جل و بەرگم پۆشی. نا، درۆ نەبوو، ئەو لێرە لە هۆدەی من، لە ناو تختووخواب وجێووبانی من، هات گیانی تەسلیمی من کرد. لەش و گیانی هەر دووکی بە من دا!

هەتا زیندو بوو،هەتا زەمانێک کە چاوەکانی لە ژیان پڕوو لێپاو لێپ بوو،تەنیا یادگاری چاوەکانی ئەمنیان ئەشکەنجە و جەزرەبە دا، ئێستا بی هەست و

خوســــــت و جــــــولانەوە، ساردوســــــڕ بە چاوەكــــــانی لە ســــەریەک دانــــراو هــــات، خــــۆی تەســــلیمی مــــن كــــرد، بە چاوی بەستراو!

ئەوە هەمــــان كەســــە، كە ســــەر جەمــــی ژیــــانی منــــی زەهــــراوی كــــرد بــــوو، یــــان لە بنەڕەتــــدا ژیــــانی مــــن ئامــــادە بــــوو كە ژەهــــراوی بكــــرێ و ئەمــــن جــــگە لە ژیــــانی ژەهــــراوی ژیــــانێكی دیــــكەم نەدەتــــوانی هەبێــــت. هەنــــووكە، لێــــرە لە هــــۆدەكەم لەش و ســــێبەركەی بە مــــن بخشــــی. گیــــانی تێكشــــكاوی ئامــــانەتی وی كە چ پەیوەنــــدیەكی لە گەڵ دونیــــای ســــەر گــــۆی زەوی نەبــــوو، لە نــــاو جــــل و بەرگــــی ڕەش و بە چــــین و پــــزووی لە ســــەرە خــــۆ هــــاتەدەر،لە نــــاو لەشــــێک كە ئەوی ئەشــــكەنجە دەكــــرد و لە دونیــــای ســــێبەرەكانی ســــەرگەردان ڕۆیی،گویــــا ســــێبەری منیشــــی لە گەڵ خــــۆی بــــرد. بەڵام لەشــــی بــــی هەســــت و ئیحســــاس و بــــێ جــــولانەوە لە وێ كەوتبــــوو. ماســــولكەكانی نەرم و ناســــک و تەنكــــی و دەســــت پیــــدا مــــاڵین وی ڕەگەكــــانی، هێســــكەكانی، چــــاو نــــواری ڕزیــــوو بــــوون، ببــــوون. بــــۆ غەزای بە تــــام و خــــوێ بــــۆ كرمەكــــان و مشــــكەكانی ژێــــر هەرد ئامــــادە كــــرا بــــوو. ئەمــــــن لەو هــــــۆدە هەژارانەیەی تەژی لە نەكبەتــــــی ســــەقامگیر بــــووم،كە لە چەشــــنی گــــۆڕ بــــوو،لە نــــاو تاریكــــانی شــــەوی ئەبەدی كە ئەمنــــی لە بــــاوش گرتبــــوو لە بەدەنەی دیوارەكــــان چووبــــوو خــــوار، دەبــــوایە شــــەوێكی درێــــژو تارێــــک و ســــارد و بــــێ دوایــــین، لە قەراخ مــــردوو تێــــپەڕ بــــكەم. لە گەڵ جەنــــازەی وی. بە بیــــرم داهــــات كە هەتــــا دونیــــایە، هەتــــا ئەمــــن هەمە،مردوەک،مردوەكــــی ســــاردو بــــێ هەســــت و

ئیحســــــاس و جـــــولانەوە لە هـــــۆدەی تاریـــــک لە گەڵ مــــــن
بووە.

لەم چـــــرکەدا هـــــزرم ســـــەهۆڵبەدان بوو،ژیـــــانێکی بێـــــوێنە
وکەســـــینی، ســـــەیر لە منـــــدا وەدیهـــــات. چـــــونکە ژیـــــانم
پەیوەنـــــــدی بە هەمـــــــوو ئەو هەبوونـــــــانە دەبـــــــوو کە لە
دەورەی مــــــن بــــــوون،بە هەمــــــوو ســــــێبەرەکان کە لە دەورو
پشــــــــــت و قەراخ قوجــــــــــاخم هەڵــــــــــدەلەرزین و
پەیوەنـــداریەکی قـــووڵ و جیـــا نەکـــراو لە گەڵ دونیـــاو جـــم
و جـــــۆڵی گیـــــان لەبەر و سروشـــــتیان هەبـــــوو بە هـــــۆی
زنجیـــــرە هەوداکـــــانی نادیـــــاری جەرەیـــــانی پەریشـــــان و
بـــێقەراری نێـــوان مـــن و هەمـــوو هۆکارەکـــانی سروشـــتی
بەر قەرار بـــوو. هـــیچ جـــۆرە فکـــرو خەیـــاڵ بە بۆچـــوونی
مـــن، ناسروشـــت نەدەهـــات. ئەمـــن دەمتـــوانی و دەشـــیام
بە ســـانایی بە ڕەمـــزو ڕمـــووزو نهێنـــی شـــکڵەکانی کەو
نـــارا، بە ڕەمـــزو ســـڕیات و کتێبەکـــانی ئارووشـــەی
فەلســـەفە، بە ئەپـــتەری وئاقڵســـووکی، هەر بـــووگ و
ئەزەلـــی هەمـــوو جـــۆرە تێـــبگەم، چـــونکە لەم چـــرکەدا
ئەمـــن لە خولـــوو ســـووڕی زەوی و ئاســـمانەکان، گەشـــەو
هەڵـــدانی ڕەووک، داروگیـــا بە گشـــتی هەرچـــی لە زەوی
شـــین دەبـــێ، جـــم و جـــۆلی گیانـــداران بەشـــدادریم
هەبـــوو،ڕابردوو داهـــاتوو،دوورو نزیـــک،لە گەڵ ژیـــان و
ئیحساســـاتی مـــن هـــاو بەش و شـــەریک و تـــێکەڵ بـــوو.
لەم جـــۆرە چاخـــانە هەر کەس بە عـــادەتێکی بە هێـــزی
ژیـــانی خـــۆی، بەواز واز بـــوونی خـــۆی، پەنـــابەر دەبێـــت:
ئـــارق خـــۆر، دەچـــی مەســـتی دەکـــات، نووســـەر
دەنووســـێ، بەرد تـــراش، بەرد تراشـــی دەکـــات و
هەرکـــام دەقـــی دڵ و بیـــرو بـــاوەڕو ئاقیـــدەی خۆیـــان بە
هـــۆی هەڵـــوەدایی لە دنەدەری بە هێـــزی ژیـــانی خـــۆی

بەتاڵ دەکەن. لەو کاتەیە کە هونەر مەندی بە
راستی دەتوانێ لە خۆی شاهکار بە وجود بێنێ
وبخولقێنێ.

بەڵام ئەمن ! ئەمن کە بێ زەوق و هەژار بووم، شکڵ
کێشێکی سەر جلدی قەڵەمدان، دەمتوانی چ بکەم؟
بەم شکڵانەی ویشک و بریقەدار و بێ گیان کە
هەمووی یەک شکڵ بوو، دەمتوانی چی بکەم، کە
شاکار بێت؟ بەڵام لە تەوای بوونی خۆم زەوقی
لێپاولێپ و تین وگوڕی لە ڕادە بەدەرم هەست
پێدەکرد، جۆرێک میر ئاخوری تایبەت بووم،
دەمەویست ئەو چاوانەی کە بۆ هەمیشە بەسترا
بوون، لە سەر کاغەز بکێشمەوە و بۆخۆمی هەڵگرم.
ئەو هەستە ئەمنی وادارکرد کە بڕیاری خۆم بە
کردەوە بەڕێوە بەرم. یانی لە دەست خۆمدا نەبوو.
ئەویش کاتێک کە مرۆڤ لە گەل مردوەک لە
بەندیخانە دایە. ئەو فکرە خۆشیەکی ناخازای لە من
وەدیهێنا و ئیجاد کرد. لە ئاکامدا چرا کە دووکەڵی
دەکرد، کوژاندەوە، دوو بێسوس وشەمدانم هێنان لە
بن سەری ویم هەڵکردن، لە بەر شەبەقی لەرزۆکی
شەمەکان شیوەی ڕوخساری ئارامتر بوو، لە سێبەری
روناکی، هۆدە حاڵاتێکی ڕەمزاوی بە خۆوە گرت.
قاقەزو کەلووپەلی کارم هەڵگرت،هاتمە قەراخ تەختی
وی- چونکە ئیدی ئەو تەختە ماڵی وی بوو-
دەمەویست ئەم شکڵەی کە زۆر هێور و وردە وردە
مەحکوم بە لێک بڵاو بوون و نەبوونە، ئەو شکڵەی کە
بە ڕەواڵەت بێجوڵە و لە یەک حاڵاتدا بوو، بە
ئاسودەیی وێنەی بکێشم،لە سەر قاقەز ڕێگاکانی

حەسلی وی تۆمار بکەم،هەر ئەو خەتانەی کە لەم ڕوخسارە کاریان لە من کرد، هەڵبژێرم.

بۆیەکاری هەر چەند کورت و ئاسایی بێت، بەڵام دەبێ کار تێکەربێ و گیانی هەبێت. بەڵام ئەمن کە عادەت بە بۆیەکاری چاپی سەر جلدی قەڵەمدان کرد بوو، ئێستا دەبێ فکری خۆم وەکار خەم و خەیاڵی خۆم، یانی ئەو خەیاڵەی کە لە ڕوخساری وی لە من دا کار تێکەری هەبوو لە بەر چاوی خۆم شکڵ گرتووی بکەم، چاوێک لە دەموو چاوی وی بکەم، پاشان چاوەکانم بقووچێنم، ئەو ڕێگایانەی کە لە ڕوخساری ویم هەڵبژاردوون بۆ سەر قاقەز دابەزێنم، هەتا بەم هۆکارە بە لێکدانەوەی خۆم بەڵکوو تریاکێک بۆ گیانی ئەشکەنجە کراوم بدۆزمەوە. لە ئاکامدا لە ژیانی بێجووڵە بە ڕێگاکان و شکڵەکانم پەنابرد.

ئەم مەبەستە لە گەڵ شێوەی بۆیەکاری مردوی من، شایانبوونو وێکچوونێکی تایبەتی هەبوو. بۆیەکاری لە ڕووی مردوو- لە حەسڵدا- ئەمن شکڵ کێشی مردوان بووم. بەلام چاوەکان، چاوەکانی بەستووی وی، ئاخۆ پێویست بوو جارێکی تر ئەوان ببینم؟ ئاخۆ بە ڕادەی بەس لە هزرو فکرو مێشکی من، شکڵیان نەگرتبوو، جەستەیان پەیدا نەکردبوو؟

نازانم هەتا نزیکاتی بەیان چەند کەڕەت لە ڕوخساری وی بۆیەکاریم کرد! بەلام هیچ کامیان ئەمنیان ڕازی نەکرد، و لە گەڵ حەزی من نەیاندەخوێندەوە. هەرچی دەمکێشا، دەمدڕاند- لەم کارە نە ماندوو دەبووم و نە هەستم بە تێپەڕ بوونی زەمان دەکرد.

تاریکوو ڕوونی بەیانی بوو،ڕوناکایەکی بولێڵاوی لە پشت شووشەکانی پەنجەرەی هاتبوو ژۆری هۆدە. ئەمن خەریکی شکڵێک بووم کە بە بۆچوونی خۆم لە هەموان باشتر بوو،بەڵام چاوەکانی، ئەو چاوانەی کە لە حاڵاتی سەر کۆنە دابوو، وەکوو ئەوەی تاوانێکی قەبوڵناکەر لە من ڕویدابیت! نەمدەتوانی ئەو چاوان لە سەر قاقەز دابەزێنم. یەکجارەکی هەموو ژیان و بیرەوەری ئەو چاوانم لە زەین بنەبڕو بوو، مەحوو ڕەشبۆوە.

تێکۆشانی من لە خۆڕای بوو. هەر چەند لە ڕوخساری وی ڕادەمام نەمدەتوانی حاڵاتی وی وەبیر خۆم بێنمەوە. لە ناکاه بینیم لەو چاخەدا کوڵمەکانی وی وردە وردە سوور هەڵگەڕان و گوڵیان کرد، وەکوو ڕەنگی سووری جەرگوو دڵ، لە دووکانی جەرگ و دڵفرۆش، گیانی هاتە بەرو چاوەکانی لە ڕادە بەدەر کراوە، واق وڕماو مان، چاوەکانی کە هەموو ڕووناکایی ژیان لە ویدا ئاشکرا بوو لە گەڵ ڕوناکایەکی ناخۆش دەدروشاوە، چاوەکانی نەساخی سەر کۆنە کەری وی، زۆر سەبر کراوە و چاوی لە من کرد. بۆ یەکەمین جار بوو ئەو ئاگاداری من بوو، چاوی لە من دەکرد و سەر لە نوێ چاوەکانی کەوتنەوە سەریەک. ئەو ڕوداوە بەڵکوو چرکەیەکی نەکێشا، بەڵام بەس بوو کە ئەمن شیوەی چاوەکانی وی تۆمارکەم،و بۆ سەر قاقەز دابەزێنم. بەگەزاری پێنووسی موو، ئەم حاڵاتم کێشا و ئیدی ئەوجار شکڵەکەم نەدڕاند.

دوایی لە سەر جێگام ڕابووم،لە سەرەخۆ لە وی نزیک بوومەوە، پیم وابوو کە زیندوە، زیندو بۆتەوە،

ئەوینی من لە جەستەی وی گیان دەماندووە، بەڵام لە نزیک بۆنی مردوو،بۆنی مردوەکی لێک بڵاو بووم هەست پێدەکرا. لە سەر لەشی کرمی دەگچکە تێکدەبەزین و دوو مێش،زەرگەتەکی زێڕاوی لە دەوری وی لە بەر ڕووناکای شەم دەفڕێن و دەنیشتن. ئەو بە تەواوی مرد بوو، بەڵام بۆچ و چلۆن چاوەکانی کرانەوە؟ نازانم . ئاخۆ ئەمە لە حاڵاتێکی خەیاڵات بینی بووم؟ یان بەراستی وابوو؟ نامهەوێ هیچ کەس ئەو پرسیارە لە من بکات.

بەڵام کارێ حەسڵی ڕوخساری وی،نەک چاوەکانی بوو، هەنووکە ئەو چاوانەم هەبوو،گیانی چاوەکانیم دەویست بێنمە سەر قاقەز،ئیدی لەشی بەکاری من نەدەکات، ئەو لەشی ناسک و تەنکی وی مەحکووم بە نەمان و خۆراکی کرم و مشکی ژێر زەوی ببوو! ئیدی ئێستا لەمە بە دوا ئەو لە بەردەستی من بوو،نەک ئەمن دەست پەروەری وی. هەر چرکەیەک کە حەزم کرد بوایە، دەمتوانی چاوەکانی ببینم. شکڵەکەم بە وریایی و بە پارێزێکی تەواتر برد لە قدوولکەی حەڵەبی خۆم کە شوێنی دەخڵم بوو، تاقەت کرد و لە خڵوەتی هۆدەکەم شاردەوە.

شەو بە پێدزەو سەبرۆکە، دەڕۆیی. گۆیا بە ڕادەی بەس ماندوویی لە لەش دەر کرد بوو، دەنگەکانی دوورە دەست سەبر بە گوێچکە دەگەیین،وەکوو باڵدارێک یان باڵندەکی ڕێبوار خەوی دەبینی،ڕەنگە ڕووەک دەڕووان و شین دەبوون. لەم چاخە هەسارەیەکی ڕەنگ پەڕیوە لە پشت کۆمای هەورەکان بزر دەبوو. لە سەر روخسارم

هەناسەیەکی نرمی سبحەینەم هەست پێکرد لەو کاتەدا بانگی کەڵەباب لە دوورەوە بێسترا.

ئاخۆ لە گەڵ مردوو دەمتوانی چ بکەم؟ لە گەڵ مردوەک کە لەشی دەستی بە لێک پڕش و بڵاو بوون کرد بوو! سەرەتا بە فکردم داهات کە ئەوی لە هۆدەی خۆم دەچاڵ کەم، پاشان فکرم کرد بیبەم لە دەرێ لە بیرێکی باوێم، لە بێرێک کە دەورادەوری وی گوڵی نەیلوفەڕی لێ ڕوابێت. بەڵام هەموو ئەو کارانە بۆ وەی بوو کەسێک نەیبینێت، چەندە فکر،چەندە زەحمەت و چەندە پەیت و چالاکی پێویستە! جگە لەوانە نەمدەویست کە چاوی نامەحرەم و بیانی بەو بکەوێ. هەموو ئەو کارانەم دەبوا بە تاقی تەنیا و بە دەستی خۆم بکەم. ئەمن بە جەهەننەم! لە بناخەدا ژیانی من لە دوای وی چ فایدەی هەبوو؟ بەڵام دەبوایویە ئەو،هەر گیز، هەر گیز، هیچ کەس لە خەڵکی ئاسایی، جگە لە من نەدەیبوایە چاوی بە جەنازەی وی بکەوێ. ئەو هاتبوە هۆدەی من، جەستەی سارد و سێبەری خۆی تەسلیمی من کردبوو، بۆ ئەوەی کەسی دیکە ئەوی نەبێنێت، بۆ ئەوەی بە ڕوانینی بیانی ئالودە نەبێت. لە ئاکامدا فکرێک بە زەینم داهات: ئەگەر لەشی ویم لەت لەت دەکرد و لە چەمەدانم دەخست،هەر ئەو چەمەدانە کۆنەی خۆم و لە گەڵ خۆمم دەبردە دەر،دوور، زۆر دوور، لە چاوی خەڵک،ئەوم لە دەچاڵ دەکرد!

ئەو جارە ئیدی دوو دڵیم بە خۆ ڕێگە نەدا، چەقووی دەسک هێسک کە لە خڵوەتی هۆدە هەبوو، هێنام، و زۆر بە وردی و بە دیقەت، سەرەتا جل و بەرگی ڕەشی ناسکی کە وەکوو هەودای جاڵجاڵووکە ئەوی

لە ناوەخۆیدا حەپس کرد بوو- تەنیا شتێک بوو کە بەدەنی داپۆشیبوو- دڕاندم. وەکوو ئەوە بوو کە ئەو بەژنی بەرز ببوو! چونکە بڵندتر لە بەرێ هاتە بەر چاوم. دوایی سەرم لێکردەوە. دڵۆپەکانی خوێناوی مەییو وک دەڵەمەی سارد لە ئەوکی هاتنەدەر. دوایی دەست و قاچەکانم بڕین و هەموو لەشی ویم، لە گەڵ ئەندامەکانی بە شیوەیەکی ڕێکووپێک لە چەمدانمدا جێکردەوە و جلوو بەرگی- هەر ئەو جلەکانەی ڕەشی- بە سەرمدا هەڵکێشان،دەرکەی چەمدانم قفل کرد وگاڵەدا، ئاچەرەکەم لە گیرفانم خست. کاتێک کە خەڵاس بووم هەناسەیەکی ڕاحەتم هەڵکێشا، چەمدانم هەڵگرت،لە سەر تەرازو وزنم کرد، قورس بوو. هیچ کات ئەو هێندە هەستم بە ماندوو بوون نەکرد بوو. نا،هیچ کات،نەمدەتوانی چەمدانەکەم بە تەنیا لە گەڵ خۆم بەرم.

هەوا سەر لە نوێ هەورو بارانێکی سووکی دەست پێکرد بوو. لە هۆدە هاتمە دەر هەتا بەڵکوو کەسێک پەیدا بکەم کە چەمەدانەکەم لە گەڵ بێنیتە دەر. لەو دەورو پشت کەسێک نابیندرێ. کەمێک دوورتر بە وردیم ڕوانی لە پشت هەوای مژاوی پیرە مێردێکی چەمیاگم بینی لە بن دارێکی شەنگە بێ دانیشتبوو. چروچاوی، بە پارچەی گەردن بەندێکی پان پێچا بوو، نەدەبیندرا. سەبرۆکە چووم نزیکەم لێکرد، هێشتا هیچم نەگوتبوو،پیرە مێر پێکەنینێکی ویشک و بێحورمەتانەی کرد بە شێوازێک کە هەموو مووی لەشم قیت بوونەوە، و گوتی: (ئەگەر حەماڵت ویست ئەمن حازرم. ها... کالیسکەیەکی جەنازە کێشانەوەم هەیە... ئەمن هەموو رۆژێ مردوان دەبەمە

شاعەبدولعەزێز بە خاک دەسپێرم. ها... ئەمن تابووتیش دورست دەکەم، بە بەژن و باڵای هەر کەس تابووتم هەس، بە شیوەیەک کە مووی لێنادا،ئەمن بۆخۆم حازرم لە خزمەت دام هەر ئێستا!...).

لە سەر جێگاکەی هەستاوە، ئەمن بۆ لای ماڵ گەڕامەوە، چوومە هۆدە چەمەدانی مردوم بە هەزار زەحمەت، هەتا بەردەرگا هێنا. بینیم کە کالیسکەیەکی جەنازە هەڵگری کۆن و بێکەلک لە بەر دەرکەیە کە بەو دوو ئەسبە ڕەشە کزە وەکوو برینی لەشی مردوو بەسترا بوو. پیاوە پیرە لە لای سەرو لە شوێنی دانیشتن ڕۆنیشتبوو، شەڵاخێکی درێژی لە دەست دابوو، بەڵام ڕووی وەرنەگێڕا کە چاو لە من بکات. ئەمن چەمەدانم بە دەردی سەگ لە ناو کاڵسکە دانا کە لە نێودا، جێگایەکی تایبەتی بۆ تابووت بوو. بۆخۆشم وەسەر کەوتم لە جێی تابووت ڕاکشام و سەرم لە سەر لێواری وی دانا،هەتا بتوانم دەوروو بەر ببینم. پاشان چەمەدانم لە سەر سینگم خزاند و بە دوو دەست توندم ڕاگرت.

شەڵاخ لە هەوا دەنگی هات، ئەسبەکان بە هەناسەبڕکە وەڕێکەوتن،لە کونە تفنکی کەپۆی ئەوان، هەڵم وەکوو لولەی دووکەڵ لە هەوای بارانی دەبیندرا و شەقاوی بەرز و لە سەر خۆیان هەڵدەگرت. پاشوو پێشووی ئەوان وەکوو دزێک کە بە پێی یاسا قەمکیان بڕیابێ و لە ڕۆنی داخکراویان هەڵکێشابن، سەبرو بەرز و بیدەنگ لە سەر زەوی دادەنرا. دەنگی زەنگوڵەکانی گەردنیان، لە هەوای نمدار بە سۆزی تایبەتی لە چڕین بوو. جۆرە ئاسودەیەکی بێ بەڵگەو دەلێل و نەگوتراو سەرانسەری لەشی داگرتبووم، بە

جۆرێـــک کە لە ڕۆینـــی کالســـکەی تەرم کـــێش، ئـــاو لە نـــاو دڵـــم نەدەهەژا. تەنیـــا قورســـایی چەمـــدانم لە ســـەر قەفەسەی سینگم هەست پێدە کرد.

تەرمـــی وی،جەنـــازەی وی،وەکـــوو ئەمە بـــوو کە دایـــم و دەرهەم ئەو قورســـاییەی ســـینگ فشـــارم دەدا. تەم و مژێکـــی بوڵێـــڵ  دەورو بەری جـــادەی گرتبـــوو. کالســـکە بە تـــاڵوکەیەکی ئاســـودە و ناخـــازا، لە کیـــوو دەشـــت و چەم تێـــدەپەڕی. دەوروبەری مـــن هەتـــا چـــاو هەتەری دەکـــرد شـــوێنی تـــازەو خـــۆش دەبینـــدرا، کە ئەمـــن نە لە خەو، و نە لە هوشیاری نەمبینی بوون.

چیاکـــانی دابـــڕ دابڕ،دارەکـــانی ســـەیرو عەجایـــب و ســـەرو لـــک و چڵـــووک شـــکاوو خـــۆارەوە بوو،،تـــووک لێکـــراو، لە دوو لای جـــادە ســـەر هەڵـــداو کە لە نـــاو ئەوانـــدا خـــانوو بەرەی ڕەنـــگ خۆلەپـــۆتینە بە شـــکڵی جۆراجـــۆر ســـێ قولینچک،مســـاوی، شـــەش ســـووچی،بە پەنـــجەرەی دەکـــورت و تاریـــک بـــێ کەلـــووپەل دەبینـــدرا. ئەو پەنـــجەرانە چەشـــنی چاوەکـــانی مرۆڤـــی گێـــژ دەچـــوو کە گەنـــدە تـــای گرتبێـــت. نـــازانم دیوارەکـــان چیـــان لە گەڵ خۆیـــان هەبـــوو، کە ســـاردو ســـەرمایان هەتـــا قەلبـــی ئینســـان دەگـــوێزیتەوە. وەکـــوو ئەمە بـــوو کە هـــیچ کـــات گیـــان لەبەرێکـــی زینـــدوو نەیتوانێبێـــت لەو مـــاڵانە دانیشـــتوو بێـــت! ڕەنـــگە بـــۆ ســـێبەری گیانـــداران ئەو خانەوانە دورست کرابوو!

گۆیـــا کالســـکە ئـــاژۆ، ئەمنـــی بە ڕێگـــایەکی تـــایبەت و یـــان بەکـــوێرە ڕێگایەکـــدا دەبـــرد. بازێـــک شـــوێن تەنیـــا دارەکـــانی بـــڕاو خـــوارو خـــێچ دەورو بەری جادەیـــان گرتبـــوو، و پشـــتی ئەوان ماڵەکـــــانی نەوی و نـــــزم و بەرز بە شـــــکڵی

هەندەسی قویچ- قوچی ناتەواو- بە پەنجەرەی
دەباریک و خوار دەبیندرا، کە گوڵی نەیلوفەڕی سوور
لە قەراخ وان سەری وەدەرنابوو، بە دەرو دیوار
هەڵدەچوو. ئەم تەماشاگەیە لە ناکاو لە پشت
مژێکی بوڵێڵاوی ون بوو. هەورەکانی قورسی ئاوس،
ترۆپی چیاکانیان لە ئامێز گرتبوو ڕێک دەکوشی، نمە
نمەی باران وەکوو تۆزو خۆڵی سەر گەردان و بێ
پەسیو لە هەوا بڵاو ببوو. لە پاش ئەوەی سەر
دەمێک ڕۆیشتین، لە نزیک کێوەکی بەرزوو قاقڕی بێ
ئاو وگیا و سەوزایی، کالیسکەی تەرم هەڵگر ڕایگرت.
ئەمن چەمەدانم لە سەر سینگم لە قاند و
هەستامەوە. لە پشت چیا، شوینێکی خڵوەت و ئارام
و بە سەفا بوو، شوێنێک کە هەر گیز نەمدیبوو،
نەمدەناسی، بەڵام بە نەزەرم ناسیاگ هات. وەک وەی
لە دەرەوەی لێکدانەوەی من نەبوو. گوڵی نەیلوفەڕی
سووری بێ بۆن، هەردی داپۆشیبوو. پێموا بوو هەتا
ئێستا کەسێک قاچی بەم مەڵبەندە نەکەوتبوو. ئەمن
چەمەدانم هێنایە خوار لە هەردم دانا،پیرە مێری
کالسکەچی ڕووی وەرگێڕا وگوتی: (ئێرە
شاعەبدولعەزیمە، شوێنێکی باشتر لەمە بۆت پەیدا
نابێت، باڵندە پەڕ لێنادا. ها...).

دەستم لە گیرفانم ڕۆ کرد کریی کالیسکەچی
بدەم،لە دوو قران و عەباسێک پتر لە گیرفانم دانەبوو.
کالسکەچی پێکەنینێکی ویشک و بێئیحتڕامانەی کرد
وگوتی: (مەسەلە نییە،دوایی لێت وەردەگرم.
ماڵەکەت بەڵەدم، ئیدی بە منت کار نییە، ها... ؟
هەر ئەوەندە بزانە کە لە گۆڕ هەڵکەنین بێ ئەزموون
و ناپسپۆر نیم، ها... بەڵکوو کەمۆشم،ها؟ خەجالاتی

نـــاوێ بـــا بچیـــنه وێ، له کـــن چەم قەراخ داری شـــەنگە بـــێ، قوڵکێـــک بە ڕادەی چەمەدان بـــۆت هەڵـــدەکەنم و دەڕۆم".

مـــامە پیـــرە بە چـــالاکیەکی تـــایبەتی کە ئەمـــن نـــاتوانم خەیـــاڵی بـــکەم،لە کالســـکە هـــاتەخوار. ئەمـــن چەمەدانـــم بە نەقە نەق لە دوو خـــۆ کێشـــا وپـــێکەوە چـــووینە ڕەخ بەدەنەی دارێـــک کە لە قەراخ چـــۆمێکی ویشـــک بـــوو،ئەو گوتی: ئێرۆکە باشە؟"

و بـــێ ئەوەی چـــاوەڕوانی وڵامـــی مـــن بێـــت،بە بێڵەکـــی کچـــکە و کوڵینـــگ کە پێـــی بـــوو، خەرێکـــی هەرد هەڵکنـــدن بـــوو. ئەمـــن چەمەدانـــم لە هەرد دانـــا و لە ســـەر جێگـــای خـــۆم بێـــدەنگ ڕاوەســـتابووم. ئەو بە پشـــتی کـــۆم و چـــالاکی مرۆڤێکـــی کۆنەکـــارو کەمـــوۆ، خەریـــک بـــوو. لەو کـــوڵینەوە دا شـــتێکی وەکـــوو گـــۆزەی لعـــاب دۆزیەوە،ئەوی لە دەســـماڵێک پێچـــاوەو هەســـتاوە گوتی:

" ئەم قوڵکە،هـــا...،دورســـت بە ئەنـــدازەی چەمەدانە، مـــووی لێنـــادات، هـــا..." دیســـان ئەمـــن دەســـتم دەگیرفـــانم نـــا حەقدەســـتەکەی بـــدەمێ. لە دوو قـــڕان و عەباســـیەک پتـــرم پـــێ نەبـــوو. دیســـان پیـــرە مێـــر پێکەنیێکیـــی ویشـــک و بـــێ مەزەی کـــردو گـــوتی: " پێویســـت ناکات،مەســـەلە نیـــیە،ئەمن مـــاڵی تـــۆ پیـــدەزانم، هـــا، ئەوە لە جیـــاتی حەقدەســـتم گـــۆزەیەکم دۆزیەوە، گوڵـــدانێکی راغە،ئـــی شاری قەدیمی ڕەیە،ها...".

دوایـــی بە هەیکەلـــی کـــۆمی خـــۆی پێـــدەکەنی، بە جۆرێـــک کە شـــانەکانی دەلەرزیـــن. گـــۆزەکەی کە لە نـــاو دەســـماڵێکی چڵکـــن بەســـتبوو لە بـــن هەنگڵـــی گرتبـــوو،

بۆ لای کالسکەی تەرم هەڵگر چوو و بە چالاکیەکی تایبەتی لە شوێنی خۆی دانیشت. دیسان شەڵاخی هەڵسوڕاند، هەسپەکان بە هەناسەکێشان وەرێکەوتن، دەنگی زەنگوڵەی گەردنی ئەوان لە هەوای نمدار گۆرانی تایبەتیان دەچڕی،وردە وردە لە پشت کۆمای تەم و مژ لە سێرەی چاوی من ون بوو.

چاخێک تەنیا مام هەناسەیەکی ڕاحەتم هەڵکێشا،وەکوو ئەمە بوو کە بارێکی قورسم لە سەر سینگم هەڵگرتووە، ئارامبوونەکی بە تام و چێژ ، هەموو لەشی داگرتم. لە دەورەی خۆمم ڕوانی، ئێرە شوێنێکی گچکە بوو کە لە ناو تەپۆڵکەو چیاکان گیری کرد بوو. لە سەر زنجیرە کێوێک شوێنەواری خانووبەرەکانی کەونارا، بە خشتی ئەستوور و چەمەکی ویشک لەو نزیکایی وەبەر چاو دەکەوت.

ئەم ناوچەیە ئەمین و خلوەت، دوور کەوتوو بێ ئەنگامەو چەقەو هەرا بوو. ئەمن لە قولایی دڵمەوە کەیف خۆشبووم و لە پاڵخۆمدا فکرم دەکرد ئەو چاوانەی گەورە کاتێک کە لە خەوی سەر گۆی زەوی وەخەبەر دێ، جێگەیەکی بە لێهاتووی خانووبەرەو قیافەکەی دەدۆزیەوە، ئەو چاخ دەبوایە کە ئەو دوور لە خەڵکی تر،دوور لە مردووی ئەوانی تر بوایە، هەر بەم جۆرەی کە لە ژیانیش دوور لە زیواری خەڵکی دیکە بوو.

چەمەدانم بە پارێز هەڵگرت و لە ناو قوڵکەکەم خست. قوڵکەکە دورست بە ئەندازەی چەمەدان بوو. مووی لێ نەدەدا. بەڵام بۆ دوایین جار ویستم تەنیا جارێک لە وی- لە چەمەدان- بنۆڕم. لە دەورو پشتی

خـــۆم ڕوانـــی کەســـی لێـــدیار نەبـــوو. ئـــاچەرم لە گیرفـــانم هێنـــــادەرو دەرکەی ویـــــم کـــــردەوە. بەڵام چاخێــــک کە قـــولێنچێکی جلـــی ڕەشـــی ویـــم وەلابـــرد،لە نـــاو خـــوێنی دڵەمە بـــــوو، و ئەو کرمـــــانەی کە لولیـــــان خـــــوارد بـــــوو، دووچـــــاوی گەورەی ڕەشـــــم بینـــــی کە بـــــێ جـــــوڵە راســـــتەوخۆ، چـــــاوی لە مـــــن دەکـــــرد، و ژیـــــانی مـــــن لە بنەبـــــانی ئەو چـــــاوانەی قـــــوم ببـــــوو. بە تـــــاڵوکەو بە پەلە دەرکەی چەمـــدانم گـــاڵەدا و خـــوڵم وەســـەر کـــرد پاشـــان بە پـــێ شـــێلام،دوایی کڵـــۆ بەردو خیـــزم هێنـــا بەســـەرمدا کـــرد هەتـــا شـــوێنی قەبەر بە تەواوی لـــێ پـــاک بێـــتەوە، بە جۆرێـــک کە هـــیچ کەســـێک نتوانێـــت ئەوی هەڵاوێـــری. بە شـــێوەیەکی بـــاش ئەم کـــارەم کـــرد کە بۆخۆشـــم نەمدەتوانی قەبری وی لە باقی زەوی لێکهەڵاوێرم.

کـــارم کە تەواو بووگ،چـــاوێکم لە خـــۆم کـــرد،بینیم جـــل و بەرگـــم خۆڵاوییە،دڕیـــاوە، وخـــوێنی مەیـــو بـــووگی ڕەش بە وی نوســـاوە، دوو مـــێش و زەرگەتەیەکـــی زێـــڕاوی لە دەورەم لە بـــاڵە فـــڕە دابـــوون ، کرمـــی دەگچـــکە بە لەشـــم وەنووســـا بـــوون، کە لە نـــاو یەکـــدا دەجـــوڵانەوەو تیکـــدەبەزین و لێـــک دەهـــاڵان. ویســـتم پنـــۆکی خـــوێنی ســـەر جلـــوو بەرگـــم خـــاوێن کەمەوە، بەڵام هەر چـــی کـــردم و کرانـــدم و قـــۆڵی کراســـم بە ئـــاوی زارم تـــڕ کـــردو لـــێم خشـــاند، پنۆکەکـــانی خـــوێن خەرابتـــر هەلینگانـــدەدا و خســـت و خـــۆڵتر دەبـــوو. بە جۆرێـــک کە تەواوی جـــل و بەرگـــی منـــی داگـــرت و ســـاردو ســـەرماو زوقـــم و ســـەیاقەی لیچـــق بـــوونی ویـــم لە ســـەر لەشـــم هەســـت پێکرد.

درەنـــگ وەختـــان بـــوو،نزیکەی ڕۆژ ئـــاوا،نمەنمە بـــاران دەبـــاری، ئەمـــن بـــێ ئەوەی بمـــهەوێ شـــوێن پێـــی

تەگەرەی کالسکەی تەرم هەڵگرم وەبەر خۆم داو،وەڕێکەوتم. چاخێک کە هەواو بان تاریک بوو شوێنی تەگەری کاڵسکەی جەنازە هەڵگرم ون کرد. بە سەر لێشێواوی بێ وەی بزانم دەچمە کوێ، بی فکرو ئیرادە لە تاریکی شەوی ئەنگوست لە چاوی تێکچڕژاو لە سەرەخۆ دەڕۆیشتم و نەمدەزانی بۆ کوێ دەچم! چونکە پاش وی، دوایی ئەوەی کە ئەو چاوانەی گەورە لە ناو گۆمیلکەی خوێندا بە دەڵەمەم بینی بوو،لە شەوێکی تاریک،لە شەوێکی قووڵ کە هەموو ژیانی منی داگرتبوو وەڕیکەوتبووم دەڕۆیشتم، چونکە ئەو دوو چاوەی کە وەکوو چرا بوون بۆ هەمیشە کوژا بوونەوە، و لەو حاڵەدا بۆم وەک یەک بوو کە بە شوێن و قۆناغ و مەنزڵێک بگەم، یان هیچ کات نەگەم.

کپ و بێدەنگی تەواو حوکمڕانی دەکرد. وام بە زەین داهات کە هەموو ئەمنیان جێهێشت بوو. بە بوونەوەرانی ناگیاندار پەنام برد. پەیوەندی نێوان من و جەرەیانی سروشت، نێوان من و تاریکیەکی قووڵ کە لە گیانی من دابەزیبوو وەدیهاتبوو. ئەو بیدەنگییە جۆرە زوانێکە کە ئێمە مانان تێی ناگەین،لە توندو تیژی کەیف خۆشی سەرم گیژ بوو، مامە سورەم گرت،حاڵاتێکی ڕشانەوەو ئیستفڕاخم بۆ هاتە پێش،و لاقم سست و شل بوون و پۆچانەوە. ماندوو بوونێکی بێ دوایینم لە خۆمدا هەست پێکرد، چوومە ناو قەبرستانی ڕەخ جادە و لە سەر بەردی گڵکۆیەک دانیشتم، سەرم لە ناو دوو دەستم گرت و بۆ حاڵی خۆم سەرگەردان و حەیران مام. لە ناکاو دەنگی پێکەنێنێکی ویشک بێ ئیحتڕامانە هەودای خەیاڵی

پســـــاندم و ئەمنـــــی وەخـــــۆ هێنـــــاوە. ڕووم وەرگێـــــڕا و بینـــــیم ئەو هەیـــــکەڵەی کە ســــــەرو دەمـــــوو چـــــاوی بە شـــــاڵگەردن پێچـــــــابوو لە قەراخ مـــــــن دانیشـــــــــتبوو و شـــــــتێکی لە دەســـــماڵێکی بەســـــتراو لە بـــــن هەنگڵـــــی دابـــــوو. ڕووی لە من کرد وگوتی:

"بیگومـــــان ئەتـــــۆ دەتویســـــت بـــــۆ شـــــاری بچـــــی، ڕێگـــــات ون کـــــردوە، هـــــا؟ ڕەنـــــگە بە خـــــۆت بڵێـــــت"ئەو وەخـــــتەی شـــــەو لە نـــــــاو گۆرســـــــــتان چ کـــــــار دەکەم؟ بەڵام خـــــــۆف مەکە، ســـــــــەروکاری مـــــــــن لە گەڵ مردوانە،کـــــــارم قەبـــــــر هەڵکەنـــــدنە، کـــــارێکی خەراو نیـــــیە، هـــــا؟ ئەمـــــن ســـــەر جەمـــــــی رێگاکـــــــان و کوێرەڕێگاکـــــــانی ئێـــــــرە بەڵەدم. مەســـــەلەن ئەمـــــرۆ چـــــووم قەبرێـــــک هەڵکەنـــــم ئەو گوڵـــــدانە لە بـــــن هەرد هـــــاتە دەر، دەزانـــــی گوڵـــــدانی ڕاغە،ئـــــی شـــــاری قەدیمـــــی ڕەیە، هـــــا؟ قـــــابیلی نیـــــیە، ئەمـــــن ئەم گۆزە بە تۆ دەدەم با لە منت بە یادگار لە لا بێت"

ئەمـــــن دەســـــتم بـــــۆ گیرفـــــانم بـــــرد،دوو قـــــڕان و عەباســـــیەکەم دەرهێنـــــا. پیرەمێـــــر بە پێکەنییکـــــی ویشـــــک گـــــوتی: نـــــا قـــــابیلی نیـــــیە، ئەمـــــن ماڵـــــت پیـــــدەزانم. لەو نیزیکـــــانە کالســـــــکەیەکی مـــــــردوو هەڵگـــــــرم هەیە، وەرە ئەتـــــۆ بـــــۆ ماڵتان بەرم. ها؟ دوو هەنگاو رێگایە".

گـــــوزەلەکەی لە داوینـــــی مـــــن هاویشـــــت و ڕابـــــوو ســـــەر پـــــێ. لە پێکەنینـــــــان شـــــــانی دەلەرزیـــــــن. ئەمـــــــن گـــــــۆزەڵەکەم هەڵگـــــــرت و بە دواى هەیکەلـــــــی پشـــــــت کـــــــۆم وەرێ کەوتـــــــم. لە ســـــــەر گەوەی جـــــــادە، کاڵســـــــکەیەکی تەرم کێشـــــی بێکەلـــــک بە دوو ئەســـــبی ڕەشـــــی و کـــــز ڕاوەســـــتا بـــــوو. پیـــــاوە پیـــــرە بە چوســـــت و چـــــالاکی چـــــوو ســـــەرو دانیشـــــت، ئەمنـــــیش چـــــوومە نـــــاو کالســـــکەو لە شـــــوێنی

تایبەت کە بۆ تابووت دورست کرا بوو، ڕاکشام و سەرم لە سەر لێوی بەرزی وی دانا. بۆ ئەوی دەوروو بەری خۆم بتوانم ببینم، گۆزەم لە سەر سینگم دانا و بە دەست ڕامگرت.

شەڵاخ وێڕەی هات، ئەسبەکان بە هەناسە هەڵکێشان وەڕیکەوتن. هەنگاوی بەرزو لە سەرە خۆیان هەڵدەگرت. لاقیان سەبرو بیدەنگ لە سەر هەرد دادەنا. دەنگی زەنگوڵەی گەردنی ئەوان لە هەوای نمدار ئاهەنگی تایبەتیان دەچڕی. لە پشت هەور، هەسارەکان وەکوو کاولی چاوەکانی برووسکەدار، کە لە ناو خوێنی مەیو بووگی ڕەش هاتبنە دەر تەماشای سەر هەردیان دەکرد. فینکایەکی ئارام و شیرین هەموو لەشی منی داگرت.

تەنیا گوڵدان،وەکوو جەستەی مردوەک سینگی منی فشاردەدا. دارەکانی پێچ پێچ بە لک و پۆپی دەخوارو خێچ، وەکوو ئەمە بوو کە لە تارێکی لە ترسی ئەمە مەبادا هەڵخولیسکێن و وەهەردی کەون، دەستی یەکتریان گرتبوو. ماڵەکانی سەیرو سەمەرە بە شکڵەکانی بڕاو بڕی هەندەسی بە پەنجەرەکانی دەست لێهەڵگیراک، ڕەشی قەراخ جادە، کوێرەوەریان کێشا بوو. بەڵام پەیکەری دیواری ئەو ماڵە، وەکوو کرمی شەوانەی ورشەدار، خەم و ناخۆشی لە خۆی فرایاز دەکرد. دارو بارەکان بە حاڵاتێکی ترسەنۆک دەستە دەستە، ڕەدیف رەدیف،تێدەپەڕین و بە دوای یەکدا هەڵدەهاتن. بەڵام وا بە نەزەر دەهات کە لاسکی نەیلوفەڕەکان لە لاقی وان دەهاڵێن وەهەرد دەکەون. بۆنی مردوو، دایم و دەرهەم لە جەستەی

مـــن رۆچـــوو بـــوو، هەمـــوو تەمەن لە تـــابووتێکی ڕەش نوســـتبووم، و کەســـێک، پیرمێرێکـــی پشـــت کـــۆم کە ڕوخســـارم نەدەبینـــی، ئەمنـــی لە نـــاو مـــژو ســـێبەرکانی تێپەڕیو دەگەڕاند.

کالســـکەی مـــردووکێش راوەســـتا،ئەمن گـــۆزەم هەڵگـــرت و لە کالســـکە هـــاتمە خـــوار. لە بەر دەرگـــای مـــاڵەکەم بـــووم، بە پەلە چـــوومە هـــۆدەکەم، گـــۆزەم لە ســـەر مێـــز دانـــا، چـــووم قـــدوولکەی تەنەکەم- هەر ئەو قـــدولکەیەی کە دەغڵـــم بـــوو و لە خلـــوەتی هـــۆدەم شـــاردبۆوە. - هەڵگـــرت و هـــاتمە بەر دەرگە،هەتـــا لە جیـــاتی حەقدەســـت، قـــدوولکەکە، بە پیـــرە مێـــری کالســـکەچی بـــدەم. بەڵام ئەو ون ببـــوو. شـــوێنپێیەک لە وییـــو لە کالســـکەکەی، نەدەبینـــدرا. ســـەر لە نـــوێ بە ناهومیـــدی بـــۆ هـــۆدەم گەڕامەوە، چـــرام هەڵگیرســـاند،گۆزەم لە نـــاو دەســـماڵ هێنـــادەر،خۆڵی ســـەر ویـــم بە قـــۆڵی کراســـم خاوێن کردەوە.

گـــۆزە ڕەنگێکـــی بـــریقەداری قەدیمـــی ونەوشـــەیی هەبـــوو، کە بە ڕەنگـــی زەرگەتەی زێـــڕاوی ورد کـــراو،دەر هـــاتبوو. لایەکـــی بەدەنەی وی بە شـــکڵی بـــادام، دەورانـــدەوری، نەیلـــوفەڕی ڕەنـــگ ســـوور بـــوو، نـــاوی وی- لە نـــاو دەورەی بـــادامی- ڕوخســـاری وی، دەم و چـــاوی ژنێـــک کشـــڕا بـــوو کە چاوەکـــانی ڕەش، چـــاوی گەورە تـــر لە ئاســـایی، دوو چـــاوی ســـەرکۆنەکەری هەبـــوو. وەکـــوو ئەمە کە لە مـــن تـــاوانێکی قەبـــووڵ نەکەر قەومایێـــت و بۆ خۆم نەمزانیبێت.

چاوەکـــانی ئەفســـوونکارو جـــادووگەری کە لە حـــاڵی پریشـــان و مشـــەوەش و ســـەر گەردانـــی، هەڕەشـــەکەرو

واده دەر بوو. ئەو چاوانەی دەترسان و ڕایاندەکێشا، و
برووسکەیەکی ماوەرای سروشتی مەست هێنەریان
لە بن وی دەدروشاوە. کوڵمەکانی
دەرپەڕیو،نیوچاوانی بەرز، بڕۆکانی باریک و تیکەڵ،
لێوەکانی گۆشتاوی نیوە کراوەو بسک و کەزی ئاڵۆزی
هەبوو کە قولێک، لە سەرپانایی لاجانگی سانی
بەستبوو.

ئەو وێنەیەی کە دوێنێ شەو لە روخساری ویم
هەڵگرتبوۆوە لە ناوی قدوولکەی حەڵەبیم دەرهێنا،لە
بەر یەکم دانان، لە گەڵ ئەو شکڵی گۆزە
نیسکۆڵەیەک تەوفیری نەبوو، وەک ئەوە کە کۆپی
یەک بن. هەر دووکی ئەوان یەکێک و کاری شکڵ
کێشێکی چارە ڕەش ، لە سەر قەڵەمدان ساز ببوو.
ڕەنگە گیانی نقاشی گۆزەی لە کاتی کێشانەوەی
چۆبیتە کەڵێشەی من و دەستی من لە بەر دەستی
ویدا بووبێت. ناکری ئەم دوو شکڵە لێک هەڵاویردرێن.
تەنیا ئەمە نەبێت کە نەقاشیەکەی من لە سەر قاقەز
بوو،لە حاڵێکدا شکڵی سەر گۆزە ڕەنگی ڕوناکی
قەدیمی هەبوو کە گیانی مەڕمووز،گیانێکی بیانی و
غەریب و نائاسایی بەم شکڵەی دا بوو، و ئاورینگی
گیانی شەڕورێک لە بن چاوانی دەدرەوشاوە.
نا،جێگای باوەڕ نەبوو! هەر ئەو چاوانەی گەورەو
بێفکر، قیافەیەکی ڕازدار و لە عەینی حاڵدا ئازاد!

چ کەسێک ناتوانێ تێبگات و لێی حاڵیبێت کە چ
هەست و ئیحساسێک بە منی دەست دا! ئاخۆ
ڕوداوەکی ئەوها لە کردنهاتووە؟ سەر جەمی بەخت
ڕەشیەکانی ژیانم سەر لە نوێ لە بەر چاوم بوون بە
خاوەن جەستە. ئاخۆ تەنیا چاوەکانی کەسێک لە

ژیانمدا بەس نەبوو؟ ئێستا دووکەس ئەبەو چاوانە،ئەو
چاوانەی کە ماڵی وی بوو،چاویان لە من دەکرد! نا،بە
تەواوی بەدەر لە تاقەت بوو. چاوێک کە بۆ خۆی لە
وێ نزیک چیا، لە قەراخ بەدەنەی دارێکی شەنگەبێ،
لە ڕەخ چەمێکی ویشک بە خاک ئەسپاردرا بوو. لە
بن گوڵەکانی نویلوفەڕی سوور،لە ناو خوێنێکی مەیو،
لە ناو کرم و گیانلەبەران و پێوەدەرو گەزۆک، کە لە
دەورەی وی جەژنیان گرتبوو، ڕیشەی گیاکان خیرا لە
کاولی چاوی وی ڕۆ دەچوو کە شیرەکەی بمژێ،
ئێستا بە ژیانێکی پتەو لێپالێپ چاوی لە من دەکرد!

ئەمن خۆم هەتا ئەو ڕادەیە چارە ڕەش و تووک و نزا
لێکراو، فکر بۆ نەدەکردەوە، بەڵام بە هۆی هەستی
تاوانێکی گەورە کە لە من دا شراوە بوو،لە عەینی
حاڵدا کەیف خۆشی بێ بەڵگە، سەرخۆشی
نائاسایی بە منی دەست دا، چونکە تێگەییم کە تاقە
کەسێکی هاوەدەردی قەدیمیم هەبووە. ئاخۆ ئەو
شکڵ کێشی قەدیم، شکڵ کێشێک کە لە سەر ئەو
گۆزەیەی سەتان هەزار ساڵ پێش نەقاشی کرد بوو،
هاوەدەردی من نەبوو؟ ئاخۆ دونیای منی ڕێ نەپڕیبوو؟

هەتا ئەو چرکە ئەمن خۆم بە بەخت ڕەشترین
بوونەوەر دەزانی،بەڵام حاڵیبووم کە لە سەر ئەو
چیایانە و لەو ماڵانە و ئاوەدانیانەی خاپۆرو وێران کە
بە خشتەی قورس دورست کرا بوون، خەڵکانێک
تێیاندا ژیاون کە ئێستا ئێسکی ئەوان رزیوە و ڕەنگە
زەڕراتی بەشکانی جۆراو جۆری لەشی ئەوان لە ناو
گوڵەکانی نیلوفڕی سوور ژیانیان دەکرد، لە ناو ئەو
خەڵکە شکڵ کێشێکی بەلەنگازو بارکەوتوو، شکڵ
کێشێکی تووک و نزا لێکراو،ویدەچی شکڵ کێشێکی

قەڵەمدان سازی بەخت ڕەشی وەکوو من هەبووبێت، ڕاست وەکوو من. ئێستا حاڵیبووم،تەنیا دەمتوانی تێبگەم و بفامم کە ئەویش لە ناو دوو چاوی زلی ڕەش سووتاوەو تواوەتەوە، دورست وەکوو من. ئەمە بە منی دڵداری دەدا.

لە ئاکامدا نەقاشیەکەی خۆم لە کن نەقاشیەکەی گۆزە دانا و بەرابەرم کرد، پاشان چووم مەنقەڵی تایبەتی خۆم ساز کرد،کە ئاور پریشک و ئاورینگی دەدا، هێنام لە پیش شکڵەکانم دانان. چەند قوم وافورم هەڵمژی و لە دونیای خەیاڵات لە وێنەکانم ڕوانێ،چونکە دەمەویست فکرو هزری خۆم کۆ کەمەوە، و تەنیا دووکەڵی تریاک بوو کە دەیتوانی فکری من کۆ کاتەوە و ئاسودەیی فکریم بۆ دەستەبەر کات.

ئەوەندەی تریاک مابوو هەڵممژی وکێشام هەتا ئەم ئەفیوونی فەقیر هەموو ئارووشەو ئەو پەردانەی کە پیشی چاوی منیان گرتبوو،ئەو هەموو یادگاریانەی لە بەر دەست و ڕەنگ بۆری خۆڵە پۆتینە و تێکچڕژاوو تێکشیڵدراو بڵاو بکات. ئەو نەشئەی کە چاوە ڕوانم دەکرد بۆی هێنام، کە زیدەتر لە چاوەڕوانم بوو. وردە وردە هزرەکانم،وردبین، مەزن و ئەفسونگەر بوون، لە حاڵاتێکی نیوە خەو بێهۆشی کەوتم، پاشان وەکوو ئەمە بوو کە تەوژم و قورسایی لە سەر سینگم هەڵگیرا، وەکوو ئەمە یاسای سەنگینی بۆ من وجودی نەبوو، بە شیوەیەکی ئازادانە بە دوای هزرم کە مەزن،زەریف و لەتیف و مووقەڵێش ببوو باڵمگرت و فڕیم.

جۆره خۆشحاڵیەکی قووڵ و له گوتن نەهاتوو هەموو لەشی داگرتم. له زیندانی باری لەشم ئازاد ببووم. دونیایەک ئارامی و ئاسودەیی، بەڵام تەژی له شکڵ و ڕەنگی ئەفسونگەرو شیرن... دوایی تشک و دامینی هزرم هەڵپچڕا و لەم ڕەنگانه و شکڵانه دەتواوه. له ناوشەپۆلان قوم دەبووم که تەژی و دارماڵ له لاواندنەوەی کارتێکەر بوو. دەنگی قەلبی خۆم دەبیسی،جوڵەی هاتووچۆی خوێنم له ڕەگ و دەمارەکانمدا هەست پێدەکرد. بەڵام ئەوحاڵاته بۆ من لێپالیپ له ماناو کەیف بوو. له قوڵای دڵ دەمەویست و ئارەزوم دەکرد، که خۆم دەستەبەری خەوی له بیر چوونەوه بکەم. ئەگەر ئەو له بیر چوونەوه مومکین دەبوو! ئەگەر دەیتوانی دەوام بێنیێ! ئەگەر چاوەکانم دەکەوتنه سەر یەک له دونیای خەو له سەرەخۆ له نەبوون دەتواوه، بوونی خۆم هەست پێ نەدەکرد! ئەگەر گونجاو بوو له پنۆکێکی رەنگین،له ئاهەنگێک، گۆرانیەک، له گەڵ ورشەی ڕەنگین سەر جەمی هەستم تێکەڵ دەبوو، و پاشان ئەم شەپۆل و شکڵانه ئەونده گەورەو مەزن دەبوون، دەی ئاژۆت  که به تەواوی  نەدەماو له ناو دەچوو به تاسەو ئارەزووم گەیبووم.

ورده ورده حاڵاتێکی بێدەنگی و بێهەستی بۆ من هاته پێش،وەک جۆرێک ماندووبوونی ئارامبەخش و شیرین، یان شەپۆلێکی زریف بوو، لەشم بۆ دەرەوەی دەدەڵاند. پاشان هەستم پێکرد که زیوارو ژیانی من بۆ پشتەوه دەگەڕاوه. سەبر سەبر ڕوداوەکانی ڕابردوو و یادگاری و بیرەوەریەکانی ستڕاوەو له بیرکراوی سەردەمی مناڵی خۆم دەبینی.

نەک تەنیـــــا دەمـــــدیتن بەڵکـــــوو لەو هەراوهوریـــــانە بەشـــداریم هەبـــوو و هەســـتم بەوان دەکـــرد. چـــرکە بە چـــرکە، گچکەتـــرو چکـــۆڵەتر دەبـــووم. دوایـــی لە ناکـــاو هزرو فکرم ڕەشبۆوەو لە ناوچوو وتاریک بوو.

هـــاتە بەر چـــاوم، کە تەواوی بـــوونی مـــن، بە ســـەری چەنگـــاڵێکی باریـــک گرێـــدراوە و لە بنەبـــانی بیرێکـــی قـــووڵ و تاریـــک هەڵاوەســـرا بـــوو. پاشـــان لە ســـەر چەنگـــاڵەکە بەردرام. دەخوشـــیم و دەلەقـــیم و دوور دەبـــوومەوە بەڵام وە هـــیچ شـــتێک نەدەکەوتـــم. هەڵـــدێریکی بـــی دوایـــین لە شـــەوێکی ئەبـــددی بـــوو. لە پـــاش ئەوی پەردەکە بنەبـــڕ بـــوو واســـتراوە بەدوای یەکـــدا لە بەر چـــاوی نەقشـــی دەبەســـت. چرکەیەکـــی لە بیـــر کـــردنم لە ســـۆنگەی وی بـــڕی. کاتێـــک کە وەخـــۆ هـــاتمەوە بە جارێـــک خـــۆم لە هـــۆدەیەکی گچـــکە بینـــی و لە حـــاڵاتێکی تـــایبەتی دابـــووم کە لە لام ســـەیر بـــوو، لە لایەکیش بۆم سروشتی بوو.

***

لە دونیـــایەکی تـــازە کە وەخەبەر هـــاتبووم ئاقـــارو دەوروبەری و چلۆنـــایەتی وکەرخ و هەلـــوو مەرجـــی وێ بە تەواوی بـــۆ مـــن ئاشـــنا و نزیـــک بـــوو، بە شـــیوەیەک کە زێـــدەتر لە مەڵبەنـــدی ژیـــانی پێشـــۆی خـــۆم بە وێ ئـــاودەمیی و ئـــوگریم گرتبـــوو. وەکـــوو ئەوەی کە ڕەنگـــدانەوەی ژیـــانی بەڕاســـتی مـــن بـــوو. دونیـــایەکی دیـــکە بەڵام بە ڕادەیەک لە مـــن نزیـــک و پەیوەنـــداربوو کە بە نەزەرم دەهـــات کە بـــۆ ئاقـــارو دەوروبەری حەســـڵی خـــۆم گـــڕاومەوە. لە دونیـــایەکی قەدیمـــی بەڵام لە عەینی حاڵ نزیکتر و سروشتی تر لە دایک ببووم.

هەواو بان هێچتا تاریک و ڕوون بوو. چۆڵەچرایەک لە سەر دەلاقەی هۆدەکەم دەسوتا،جێووبانەکەم لە قولینچکی هۆدە کەوتبوو. ئەمن وەخەبەر بووم، هەستم پێدە کرد کە لەشم گەرمە، پنۆکەکانی خوێن بە عاباو شاڵگردنم وەنووسابوو. دەستەکانم خوێناوی بوو. بەڵام لە گەڵ بوونی گەندەتاو،جۆرێک دڵتەنگی و پریشانی و وروژاو بوونی تایبەت لە من دا وەدیهاتبوو کە توندوتیژتر لە فکری بنەبڕکردنی شوێنەواری خوێن بوو، بە تابشت تر لەمە بوو کە دارۆغە بێت و ئەمن دەست بە سەر کات.

بێجگە لە وەش سەر دەمێکی دوورو درێژ بوو کە چاوەڕوانیم دەکرد وەدەست دارۆغە کەوم. بەڵام بڕیارم گرتبوو کە بەر لە گرتنم پێاڵەی شەڕابی ژەهراوی کە لە سەر دەلاقە بوو بە قومێک وەنۆشم. ئەمە ئاتاجی بە نووسین بوو کە بۆ من بە ئەرکێکی مەجبووی بوو. دەمەویست ئەو دێوەی کە سەر دەمێکی دوردرێژ بوو لە ناخەوە ئەمنی ئەشکەنجە و جەزرەبە دەدا، بۆ دەرەوەی دەر بکێشم. دەمەویست دڵی پڕی خۆم لە سەر قاقەز دابەزێنم. لە ئاکامدا دوایی هیندێ شک و دوو دڵی، چۆڵەچرام هێنایە پێش و بەمجۆرە دەستم پێکرد:

ئەمن دایم و دەرهەم فکرم بۆی دەچوو، خەیاڵم دەکرد کە بیدەنگی باشترینی شتە. و بۆچوونم وابوو وام دەحایشاند کە وا باشە مرۆڤ وەکوو ماسیگرە لە ڕەخ دەریا پەڕو باڵی خۆی بکاتەوە و تەنیا دابنێشت. بەڵام هەنووکە ئیدی بە دەستی خۆم نییە، چونکە ئەوهەی کە نەدبوایە ببوایە، بوو. کێ دەزانێ؟ ڕەنگە هەر ئێستا کاتژمێرێکی دیکە، دەستەیەک پاسەوانی

مەست بۆ گرتنی من بێن! ئەمن حەز ناکەم کە تەرمی خۆم نەجات بدەم، بێجگە لەمە جێگای حاشاکردنیش نەماوە، وادابنێین ئەگەر لەکەو تنۆکەکانی خوێنیش لە بەین بەرم، بەڵام بەر لە وی وەدەست وان بکەوم، پیاڵەیەک لەو شەڕابەی، لە شەڕابی ئیرسی خۆم کە لە سەر رەفحەم داناوە دەخۆمەوە.

ئێستا دەمەوێ تەواوی ژیانی خۆم وەکوو هێشووی ترێ لە دەستم دا هەڵپشێوم و شیرەی وی- نا،شەڕابی وی- دڵۆپ دڵۆپ لە گەرووی ویشکی سێبەرم وەکوو ئاوی ممبارک بچۆڕێنم. تەنیا دەمەوێ بەر لە وەی بڕۆم ئەو دەردو کولانە، کە ئەمنی وردە وردە وەکوو خۆرە، یان دەنکە خورمای قولینچکی ئەو هۆدە، خواردوە بۆ سەر کاغەز دابەزێنم، چونکە بەو شیوەیە باشتر دەتوانم فکرەکانی خۆم ڕێک و پێک و تەکووز بکەم.

ئاخۆ مەبەستم نووسینی وەسیەت نامەیە؟ هەر گیز! چونکە نە ماڵم هەیە دیڤان بیخوات و نە دینم هەیە کە شەیتان بیبات. بێچگە لەوەش چ شتێک لە سەر گۆی زەوی دەتوانێ لە بووم گچکەترین بایەخی هەبێت؟ ئەوهەی کە ناوی ژیوارۆژیان بووە لە دەستم داوە، دامنا و ویستم لە دەستم بڕوات... وپاش ئەوەی کە ئەمن ڕۆیشتم، بە جەهەننەم! کەسێک دەخوازی ئەو شتە بێنرخانەی من بخوێنیتەوە، دەیەوێ حەفتا ساڵی ڕەشیش نەیخوینیێەوە. ئەمن تەنیا بۆ ئەوە ئاتاجیم بە نووسینە، کە ئێستا پێوستی بۆم پیدا کردوە دەنووسم. ئەمن ئەوجەم پێیە، زیدە لە پێشتر ئاتاجم، کە هزرەکانی خۆم،بیەی خەیاڵی

خۆم، بە سێبەری خۆم پەیوەندار بکەم. ئەم نیسێ بەد یوومە کە لە بەر شەبەقی چۆڵەچرا لە سەر دیواری خوار بۆتەوە، وەکوو ئەمەیە، ئەوەی کە ئەمن دەینووسم بە وردی دەیخوێنێتەوە و هەڵیدەلۆشێ. ئەم سێبەرە بێگومان باشتر لە من دەفامێ و تێدەگات! تەنیا لە گەڵ سێبەری خۆم دەتوانم و باخۆم و قسە بکەم. ئەوە کە ئەمن وادار بە ئاخافتن دەکات. تەنیا ئەو دەتوانێ و دەشێت ئەمن بناسێت،ئەو بێگومان تێدەگات.

دەمەوێ شیرەی- نا،شەڕابی تاڵی- ژیانی خۆم دڵۆپ دڵۆپ لە گەرووی ویشکی سێبەرم بچۆڕێنم و بە وی بڵێم: " ئەمە ژیانی منە!"

هەر کەسێک کە دوێنێ ئەمنی بینیوە،لاوێکی تێکشکاو بێماری بینیوە، بەڵام ئەمرۆ پیرەمێرێکی پشت کۆم دەبینێ، کە مووەکانی سپی بوونە،چاوەکانی ئاگر تێبەربوو سوژیاوەو لێوی شەکەری. ئەمن خۆف دەکەم لە پەنجەری وەتاخ چاو لە دیوی دەرێ بکەم، لە ئاوێنە تەماشا خۆم بکەم. چونکە لە هەموو شوێنێک سێبەرەکانی جوتباقیەو دووپات کەرەوەی خۆم دەبینم، بەڵام بۆ ئەوەی بتوانم ژیانی خۆم بۆ سێبەری کووڕ بووەم شیکەمەوە، دەبێ حیکایەتێک نەقڵ بکەم. چەندە حەکایەت سەبارەت بە سەر دەمی مناڵی،پەیوەند بە ئەوین و ئەوینداری، دەست تێکەڵ کردن، شایی داوەت، زەماوەند، مەرگ و مردن هەیە و هیچ کام حەقیقەتیان نییە. ئەمن لە نەقڵ و نەزیرە و دەستەواژە ماندوو بووەم.

ئەمن حەولدەدەم و تێدەکۆشم کە ئەم هێشوە بپشێوم، بەڵام ئاخۆ لە ویدا کەمترین شوێنەوارو شوێنپێ لە ڕاستی و حەقیقەت وجودی دەبێ یان نا؟! ئیدی ئەمە نازانم. ئەمن نازانم لە کوێم و ئەم لەتکە ئاسمانەی سەرەوەم، یان ئەو چەند وەجەب زەوەیەی کە لە سەری دانیشتووم ئی نیشابور، یان بلخ و یان بنارسە؟ لە هەرحاڵدا بە چ شتێک باوەڕم نییە.

ئەمن ئەوەندەم شتی پێچەوانەو دژ بە یەک بینوە و ئاخافتنی جۆراجۆرگوێبیس بوومە و ئەوەندە کە هەتەری چاوەکانم لە ڕووی شتوومەکی جۆراجۆر، خشاوە،ئەو توکڵ و تۆخ نازک و ڕەق کە گیان لە پشت وی حاشار دراوە، و نە، ئیدی ئێستا بە هیچ شت باوەڕ ناکەم. بە قورسی و ثابت بوونی پرووپێتاڵ بە ڕاستییەکانی ڕاشکاو و ڕوون و بەر چاو، هەتا ئێستا شک دەکەم. نازانم ئەگەر قامکەکانی پەنجەم لە هاونی بەردینەی قولینچکی حەسارمان بدەم، و لە وی پرسیار بکەم: " ئاخۆ سابت و موحکەمی"؟ ئەگەر وەڵام بداتەوە دەبێ قسەی وی باوەڕ بکەم یان نا!

ئاخۆ ئەمن بونەوەرێکی جیا کراوەو دیاریکراو شینبەرم؟ نازانم؟بەڵام ئێستا کە چاوم لە ئاوێنە کرد خۆم نەناسی. نا،ئەو"ئەمن"ی پێشووی مردوو،بەش بەش کراو،بەڵام هیچ سەد و لەمپەرێک لە مابەینی ئێمە بیەی نەبوو. دەبێ حیکایەتی خۆم بگێڕمەوە، بەڵام نازانم دەبی لە کوێرا دەست پێبکەم! سەرانسەری ژیان چێڕۆک و حیکایەتە. دەبێ ئێشووی

تــــرێ هەڵبپشــــێوم و شــــیرەی وی کەوچـــک کەوچـــک لە گەرووی ئەو سێبەرە پیرە،پڕێژم.

لە کــــوێڕا دەبـــی دەســــت پێبکــــرێ؟ چـــونکە هەمــــوو فکرەکـــانی کە ئێســــتا لە مێشــــکم دا دەکـــوڵێ وقوڵـــت دەدا، ئــــی هەنووکەیە،کـــــاتژمێرو دەقــــیقەو چــــرکەو ڕیکەوتـــی نیـــیە. ڕوداوێکـــی دوێنـــێ لەوانەیە بـــۆ مـــن کــــۆنەتر و بـــێ کـــار تێکەرتـــر لە ڕوداوێکـــی هەزار ســـاڵ پێش تر بێت.

ڕەنـــگە لەو جێگـــایەی کە هەمـــوو پەیوەنـــدی مـــن لە گەڵ دونیـــای زینـــدوان هەڵپچـــڕاوە، بیرەڤانیەکـــانی ڕابـــردووی پێشـــــــــــووم نەخـــــــــش دەبەســـــــــــتێ! ڕابردو،داهاتوو،کـــاتژمێر،ڕۆژ، مانـــگ و ســـاڵ هەمـــوو بـــۆ مـــن یەک جـــۆرن. قۆناغەکـــانی جـــۆراو جـــۆری منـــداڵی و پیـــری و کەلەلایـــی بـــۆ مـــن جـــگە لە ئاخافتنەکـــانی بـــێ کەلـــک و پـــۆچ شـــتێکی دیـــکە نیـــیە. تەنیـــا بـــۆ خەڵکـــانی ئاســـایی،بۆ ئەلۆوجەلۆکـــان،ئەلۆو جەلـــۆی بەتشـــدید،لەم وەشـــــەیە دەگەڕام- بـــۆ ئەلۆوجەلۆکـــان کە ژیـــانی ئەوان وەرزی و ڕادەی دیـــــاریکراوی هەیە، وەکـــــوو وەرزەکـــــانی ســـاڵ و لە نـــاوچەیەکی نـــاونجی ژیـــان هەڵکەوتـــووە، وەڕاســــت دەگەرێـــت. بەڵام ژیـــانی مـــن هەمـــوو وەرز حـــاڵاتێکی هەبـــووە، وەکـــوو ئەمەیە کە لە نـــاوچەیەکی زۆزان و لە تـــارێکی ئەبەدی رابـــواردووە، لە حاڵێکـــدا کە لە نـــاو لەشـــم دایـــم و دەرهەم گڕێـــک هەڵـــدەبێ و ئەمـــن وەکوو شەم دەتوێنێتەوەو دەکات بە ئاو.

لە نـــاو ئەو چـــوار دیـــوارەی کە هـــۆدەی منـــی لێپێکـــدێت و حەســــارەک کە لە دەورەی ژیـــانی و هزرەکـــانی مـــن کێشــــراوە زیـــواری مـــن، وەکـــوو شـــەم وردە وردە

دەتـــــوێتەوە- نـــــا،لە هەڵەدام- وەک تـــــالیش و چـــــرو چـــــیلکەی تەڕ کە لە قــــولێنچکی مەنـــــجەڵ کەوتـــــووە بە ئـــــاوری ئیشـــــکەڵی دیـــــکە بـــــرژاوەو بـــــۆتە ڕەژی، بەڵام نەســـــوتاوە، و نە تەڕو تـــــازە مـــــاوە، تەنیـــــا لە دووکەڵ و دەمـــــی ئیـــــدیکە خەفە بـــــووە. هـــــۆدەکەم وەکـــــوو هەمـــــوو هۆدەکـــــان بە خشـــــت و لە ســـــەر کـــــاولە وێرانەکـــــانی هەزاران مـــــاڵی قەدیمـــــی دورســـــت کـــــراوە، جەســـــتەی ســـــــپی کـــــــردووەوە، دەورادەوری بەردە نووســـــــی هەیە،چەشـــــــــنی مەقبەرە،ئیـــــــــدی کەم و زۆری چلۆنـــــایەتی هـــــۆدەم بەســـــە، کە دەیـــــان کـــــاتژمێری درووو درێـــــژ فکـــــری مـــــن بە خـــــۆوە بغافڵێنێـــــت، وەک کـــــاری تەنگـــــی قـــــوژبن و ســـــووچی دیـــــوار. چـــــونکە لەو کـــــاتەوە دەجێـــــدا کەوتـــــووم کەمتـــــر بە ئیشـــــەکانم رادەگەم. بزمـــــاری تەویـــــلەم کە لە دیـــــوار دابـــــوو شـــــوێنی لانکـــــی مـــــن و خێـــــزانم بـــــووە، و پاشـــــان ڕەنـــــگە هـــــاو ســـــەنگی مناڵەکـــــانی دیـــــکە بـــــار هەڵگـــــرو بە تابشـــــت بـــــووە. کەمێـــــک لە خـــــوارەوەتر بزمارێـــــک لە گەیـــــچ دیـــــوار یەک تەخـــــتە، هـــــاتوتەدەر و لە بنـــــی بـــــۆنی حەشـــــیاو پروپیتـــــاڵ و ئەو بـــــوونەوەرانەی کە پێشـــــوو لە دەرگـــــای ئەم هـــــۆدە بـــــوونە، دێ، بە جۆرێـــــک کە هەتـــــا ئێســـــتا چ جەرەیـــــان و بـــــایەک نەیتوانیـــــوە ئەو بۆنـــــانەی تونـــــدو نـــــاخۆش وەک ژێـــــر زەمـــــین و ڕیـــــخ و پەینـــــی بـــــڵاو بـــــۆوە، هەڵگـــــرێ و لە گەڵ خـــــۆی ببـــــات: بـــــۆنە ناخۆشـــــەکانی قەدیمی،بـــــۆنی زار،بـــــۆنی قـــــاچ،بۆنی ئـــــارەقەی لەش،بـــــۆنی مێـــــز، بـــــۆنی ڕۆنـــــی کۆن،بـــــۆنی حەســـــیری ڕزیـــــو، بـــــۆنی هـــــێلکەو ڕۆن ســـــوتاو، بـــــۆنی پیـــــاوازی ســـــوروەکراو لە ڕونـــــی قرچـــــاو، بـــــۆنی پەنیـــــرەک، بـــــۆنی هـــــۆدەی لاوان کە تـــــازە خۆیـــــان دەناســـــن، بـــــۆنی مـــــردوو لە حـــــاڵی گیـــــانەڵڵا، و زۆربـــــۆنی تـــــریش هەن، کە

حەسڵ و بنیاتی ئەوان مەعلووم نییە، بەڵام کارتێکەری خۆیان بەجێهێشتووە.

هۆدەکەم خلوەتییەکی تاریکە و بە هۆی دوو دەربیچە بە دەرەوە، لە گەڵ دونیای ئەلۆ جەلۆکان پەیوەندی هەیە، یەکێک لە وان بە سەر حەوشەی خۆماندا دەکرێتەوەو، ئەویدیکە ڕووی لە کۆچەی دایە، لە وێ ئەمنی بە شاری ڕەێ گریدەدا، شارێک کە بە بۆکی دونیا ناو دێرو دەنگین بوو، هەزاران کۆچەو پس کۆچە و ماڵەکانی خاپۆرە بوو، قوتابخانەو کاروانسەرای هەیە- شارێک کە گەورەترین شاری دونیا بە حیساب دێت، لە پشت هۆدەی من هەناسە دەکێشێ و ژیان تێپەڕ دەکات.

لێرە لە قولینچکی هۆدەم کاتێک کە چاوانم لە سەر یەک دادەنێم سێبەرکانی بنەبڕو تێکەڵی شار- ئەوەی لە من کارتێکەر بووە- بە کوشکەکانەو، نقێژگەکان و باخەکانی، هەموو لە بەر چاوم بوونە بە خاوەن جەستە. ئەم دوو دەربیچەیە ئەمن لە گەڵ دونیای دەرەوە ،لە گەڵ دونیای ئەلۆجەلۆکان پەیوەند دەدات. بەڵام لە هۆدەکەم ئاوێنەیەک بە دیوار هەڵاوەسراوە کە چڕو چاوی خۆم لە ویدا دەبینم. لە ژیانی سنووورداری من ئاوێنە گرنگتر لە دونیای ئەلۆجەلۆکانە کە لەگەڵ من چ پەیوەندی نییە.

لە تەواوی تەماشاگەی شار،دووکانی قەساوێکی هەژار لە پێش دەربیچەی هۆدەی منە، کە ڕۆژێ دوو پەز دەکوژێتەوە و دەفرۆشێ. هەر کات کە لە لاباجە چاو لە دەرەوە دەکەم کابرای قەساو دەبینم. هەموو ڕۆژێک بەیانی زوو دوو بارگێنی ڕەشی کز،بارگینی

بارهەڵگر، دەستی ویشک هەڵاتووی ئەوان گەیوەتە سم، وەکوو وەیە کە بە پێی یاسای وحشی دەستەکانی وانیان بڕیوەو لە ڕۆنی هەڵقرچاو ڕۆکردوە، هەموو ڕۆژێ دوو پەز بە پاشتەرکیاندا بە سامۆرتە هەڵاوەسراو، بۆ دووکان دێنن. کابرای قەساو دەستی چەوری خۆی بە سەر ڕدێنی خەنە بەستووی خۆی دادێنێ، دوونگی ئەوان بە دەستی هەڵدەسەنگێنی و وەزن دەکات، دوایی دەیبات، بە چەنگەکی دووکانی هەڵداوەسی. بارگینەکان بە هەناسە کێشان وەڕێدەکەون. ئەو کات قەساو ئەو تەرمانەی خوێناوی بەو گەردەنەی بڕاو، چاوی دەخوێن لە بەر ڕۆیو و ئەو پێڵوانەی خوێناوی کە لە ناو کەللە سەری عابی دەرپەریون، دەلاوێنێتەوەو بە دەسماڵ خاوێن دەکاتەوە، پاشان کێردێکی تیژی دەسکدار کە تایبەت بە ئێسک بڕینە، هەڵدەگرێ و بە وردی و سەلیقە لەت لەتیان دەکات، گۆشتی خالیس بە پێکەنینەوە بە مشتریەکانی دەفرۆشێت.

هەموو ئەو ئیشانە بە لەزەت ئەنجام دەدا! ئەمن دڵنیام جۆرە کەیف و لەزەتێکیشی دەبرد. ئەو گەماڵی زەردی مل ئەستووریش، کە گەڕەک و کۆچەو دەرکوو بان هەموو گەڕاوە، دایم و دەرهەم بە کڕنۆش و چاوەکانی بێتاوان بە کلکە سووتە، سیلە چاوێکی بە ئاخ و حەسەرت و سوێی لە دەستی قەساو دەکرد، سەگیش ئەو هەمووەی دەزانی، سەگیش دەزانێ کە قەساو لەو کاری خۆی زەوقی هەیە و لەزەت دەبات!

بەرێک دوورتر،لە بن هۆدەیەک، پیاوە پیرەکی حاجباتی دانیشتبوو، کە لە پێشی سفرەیەک

پانکراوەتەوە. لە ناو سفرەی وی ئالەتێکی ئاسنین بە دەستەدارێکی گیا بڕینەوە، دوودانە ناڵ، چەند جۆرە پۆلیانەو کلانەو مووروی ڕنگاو ڕەنگ و کێردیکی گۆشت بڕی، تەڵە مشکێک، گازێکی ژەنگاوی، جەوهەرێکی دەوات،شەیەکی دەنک شکاو، پێمڕۆکەیەک و گۆزەڵەیەکی ڕەنگینی دانابوو، دەسماڵێکی بە سەردا هەڵکێشابوو. ڕۆژەکان، کاتژمێرەکان،مانگەکان ئەمن لە پشت لاباجەی، چاوم لە وی دەکرد، دایم و دەرهەم بە شاڵگەردەنێکی چڵکن، عەبایەکی ششتەری،بەرۆک کراوە، کە لە ناو ویدا مووەکانی سپی سینگی هاتبوونە دەر، لە گەڵ پێلوەکانی سوژیاوی، کە بێماری و نەخۆشی بیحەیایی و قەرچەناخی و زۆر بلێیی و بێچاوڕو بە حەوت ئاو شووراوەیی وی لێدەباری. تەلیسمەکی لە باسکی بەستبووە بە شیوە حالاتێک دانیشتووە.

تەنیا شەوانەی هەینی، بەو ددانەی زەرد و کەڵبووی، قورئانی دەخویند، وەک دەیانگوت لەو ڕێگایە بژێوی خۆی دەردێنا و پیی بەڕیدەچوو، چونکە ئەمن نەمدیت کە کەسێک لە وی شتێک بکڕێ. کابرا ڕوخساری وە مۆتەو ئەو کامووسانەی کە لە خەو بینیبووم دەچوو. لە پشت ئەو کەلە مازوو تراشراوە، مەندیلێکی شیرو شەکری پێچا بوو، لە پشت نیو چاوانی کورت و تەسکی وی،خودا دەزانی چ هزر و فکری گڵاوو زواندرێژی، چەقەسرویی و چەقەسوویی، وەک گیای بێ کەلک و هەرزە ڕواوەو شین ببوو؟ گۆیا لە ڕوبەڕووی سفرەی پیرە مێر و بساتی خنزرپنزری وی لە گەڵ ژیانی وی پەیوەندی نزیکی هەبوو. چەند

کەڕەت بڕیارم گرت بچم لە گەڵ وی قسە بچڕم و یان تشتێکی لی بکڕم،بەڵام جورئەتم نەکرو نەوێرام.

دایانم بە منی گوت: ئەم پیاوە لە سەر دەمی گەنجی گۆزەلە کەر بووە و تەنیا ئەم گۆزەڵەی بۆخۆی هێشتۆتەوە، و ئێستا لە وردەواڵە فرۆشی و نان دەخوات وبژێو دەکات.

ئەمە پەیوەندی من لە گەڵ دونیای دەرەوە بوو. بەڵام لە دونیایی ژوورەوە، تەنیا دایانم و ژنێکی ڕووسپی، بۆ من ما بۆوە. بەلام نەنکم دایانی ویشە، دایانی هەر دووکمانە، چونکە نەک تەنیا ئەمن و خێزانم خزمی یەکتری بووین، بەڵکوو نەنکیشم هەر دوومانی بە شیری دایان بە خێو کرد بوو. لە حەسڵدا دایکی وی دایکی منیش بوو، چونکە ئەمن هەر لە بنیات دایک و باوکی خۆم نەبینیوە و دایکی وی- ئەو ژنی بەژن بڵند کە مووی بۆری هەبوو- ئەمنی گەورە کرد. دایکی وی بوو کە وەکوو دایکم خۆشم دەویست و بە هۆی ئەو ئیلاقە بوو کە کیژی ویم هێنا.

لە دایک و باوکم چەند جۆرە چێڕۆک و حەکایەتم بیستووە، تەنیا لەو سەر بوردانە کە نەنکی خۆشەویستم بۆی گێڕامەوە لە پاڵخۆمدا فکر دەکەم دەبی ئەمە ڕاست بێت.

نەنکی خۆشەویستم پێی گوتم کە باوک و مامم برای جمک(دوانە)بوونە، هەر دوو ویکچوونە، یانی شکڵ و قەوارو قەڵافەتێک و ئیخلاقەکیان هەبووە و هەتا دەنگیان وەک یەک بووە، بە شێوەیەک کە لە دەنگ و ڕوخسار دا کەس نەیدەتوانیوە، ئەوان لێکتر جیاکاتەوە و هەڵاوێرێ، یان هەر نەبێ بۆ هەمووکەس کارێکی

سانایی نەبووە. جگە لە مانە پەیوەندییەکی دەروونی گوزارەیی و هەست و ئیحساسی هاوەدەردی لە نێوان وان بیەی هەبووە، بەم مانایە کە ئەگەر یەکێک لەوان نەخۆش کەوتبوایە، ئەویدیکەش بێمار دەبوو، بە قەولی خەڵک،وەکوو سێوێک بوون کە لەتیان کردبن. لە ئاکامدا هەر دووکیان کاری مامەلە و توجارەتیان هەڵبژارد و لە تەمەنی بیست ساڵیدا بۆ هندوستان دەچن و شتوومەکی شاری( ڕەی) بریتی لە کۆتاڵی جۆراجۆر وەکوو: پارچەی گوڵدار، پارچەی لە پەمۆ دورست کراو،جەبە، پارچەی شاڵ موندی میرا، دەرزی،ئامان و قاپوو قاجاغ، سواڵەت،گڵی سەر شوشتن و جلدی قەڵەمدان بۆ هندوستان دەبردوو و دەفرۆشت. باوکم لە شاری بنارس بووە، و مامی بۆ شارەکانی دیکەی هند بۆ کاری مامەلە دەنارد. لە دوای سەردەمێک باوکم ئاشق و ئەوینداری کیژێک بووە کە لە گام داسی – سەماکەری پەرسگەی لینگم –دەبیت. کاری ئەو کیژەی کایکەردۆخی مەزەبی پیش بووتی گەورەی لێنگم و خزمەت لە بوتخانە بووە.- کێژێکی خوێنگەرمی زیتوونی بە مەمکی لیمۆیی، چاوی دەگەورەو شیرین خێل،برۆکانی باریک وتێکەڵ، کە لە نیوەڕاستی خاڵێکی سووری دانابوو.

ئێستا دەتوانم لە پاڵ خۆمدا خەیاڵ بکەم کە بۆگام داسی- یانی دایکم- بە پەردەی ئاوریشمی ڕەنگین زێڕدروی،سینگ کراوە، بسکی قورسی ڕەشی کە وەکوو شەوی ئەزەلی بۆڵێلی لە پشت سەری گرێ دا بوو، بازنەکانی جمکەی دەستی و پاوانەکانی بەلەکی، ئاڵقەکانی زێڕاوی لە کرکرتەی کەپۆی کرد

بـــوو، چاوەکـــانی زل و ڕەش و خومـــارو شـــیرین خێلـــی، ددانەکـــانی بـــریقەداری بە جـــولانەوەکی ســـەبر و ئـــارام و بـــاش هەڵســـەنگان کە بە ئـــاوازی ســـی تـــار و تنبـــک و تەنبـــوور ســـنج و کەڕەنـــا دەلەیـــزێ، ئـــاوازێکی هێـــدی و هێـــور و لە ســـەرەخۆ و یەکجۆر،وەکـــوو مروڤەکـــانی ڕووت کە لە بـــرنج ، کاریـــان دەکـــرد، ئـــاوازێکی پـــر لە مانـــا کە هەمـــوو ســـڕریاتی جـــادوگەری خەڕافـــات و پـــڕو پـــۆچ و شـــاوەتەکان و دەردەکـــانی خەڵکـــی هنـــد بە کـــورتی کـــۆ ببـــۆوە بە وەســـیلەی جـــولانەوی ڕیکووپێـــک و ئامـــاژەی شـــاوەت بـــزوتن- جـــولانەی ممبـــارەک- بـــۆ گـــام داســـی وەک گەڵای گـــوڵ دەکـــراوە، لەرزان و ڕاژانـــی بە شـــان و باســـکەکانی دەدا،خـــوار دەبـــۆوە دوو بـــارە کـــۆ دەبـــۆوە، ئەم جـــۆلانەوە کە مانـــاو مەفهـــومێکی تـــایبەتی هەبـــو " دەبـــوو بە لەنگەویـــج بـــادی" چ کـــارتێکەری مـــومکینە لە بـــابم کـــرد بێـــت؟بە تـــایبەت بـــۆنی ئـــارەقەو خۆنـــاوەی گـــس و یـــان بیبـــاری کە ئەو لەگەڵ عەتـــری مـــووی تـــێکەڵ دەکـــردو ببـــوو بە ڕۆنـــی ســـەندەڵ، بە تێگەیـــی شـــاوەت،ی ئەم تەماشـــەگەیەی زیـــدە کـــردوە، عەترێـــک کە بـــۆنی شـــیرەی دارەکـــانی دوورە دەســـت داوە، بە ئیحساســـاتی دوورو خنکـــاو، گیـــان دەدات. بـــۆنی بـــکەرو بەجێهێـــنەر، دەرمـــان بـــۆنی ئەو دەرمانـــانەی کە لە هـــۆدەی منـــداڵان رایـــدەگرن ولە هنـــد دێ،ڕوونەکـــانی نەنـــاس مملەکەتێـــک کە تەژی لە مانـــاو داب و نەریـــت وئاقیـــدە رســـوومی کـــۆنە، ڕەنـــگە بـــۆنی کولاوەکـــانی منـــیش بـــدا. ئەمـــانە هەمـــوو بیرەڤـــان و بیرەورەیەکـــانی دوورو کـــوزراوی بـــاوکمی وەخەبەر هێنـــاوە. بـــاوکم ئەوەنـــدە ئاشـــقی بۆکـــام داســـی دەبێـــت کە دێـــتە ســـەر مەزەبـــی کیـــژی ســـەماکەر- مەزەبـــی لێـــنگم- ،لە دوایـــی

مودەتێک کە کیژەکە منداڵی وەزگی دەکەوێ و ئاوس دەبێ، ئەوی لە پەرسگە وەدردە خات.

ئەمن تازە لە دایک ببووم کە مامم لە سەفەر خۆی بۆ بنارس دەگەڕێتەوە، بەڵام وەکوو وەیە سەلیقەو ئەوینی ویش لە گەل سەلیقەی باوکم جۆر بووە، بە دڵێک نا سەت دڵ ئاشق و موفتلای دایکی من دەبێت و لە ئاکامدا ئەوی فریوو دەدات، چونکە بە ڕەواڵەت زۆر بە باوکم چووە، ئەو کارەی سانایی بۆ دەکرێ. کاتێک کە مەسەلە ئاشکرا دەبێ، دایکم دەڵێت هەر دووکانیان بە جێدێڵێت، مەگین بەم مەرجە کە باوکم و مامم ئەزموونی "مارناگ" بدەن و هەر کام لەوان کە زیندوە ماوە، ئەو دەبێتە ماڵی وی.

کێبەرکێ یەکەش لەو قەرارەی بووە کە باوکم و مامم دەبێ لە هۆدەیەکی تارێک وەکوو زیندان لە گەڵ "ماناگ" بهێڵنەوە و هەر کام لەوانە کە مارناگ پێوەدا سروشتییە کە هاوار دەکات، ئەو کات خاوەن مار هۆدەکە دەکاتەوە و ئەوی دیکە نەجات دەدا، بۆگام داسی دەبێتە ئی وی.

دەجا بەر لە وی کە ئەوان لەو هۆدە تاریکە باوێن، باوکم لە بۆگام داسی دەخوازێ کە جارێکی دیکە لە پێشە وی سەما بکات، سەمای ممبارەکی عیبادەتگاە، ئەویش داخوازیەکەی قەبووڵ دەکات و بە ئاوازی بلوێری خاوەن مار لە بەر ڕووناکایی چراوگ، بە ئەداو ئەتوارێکی تەژی لە مانا و ڕێکوپێک و لە شوێێکی خزیلک و خلیسک دەست بە هەڵپەرکێ دەکات و وەکوو مار پاپۆکە دەبەستێ و لێکداڵێ وپێچ دەخوات. دوایی باوکم و مامم لەو هۆدەیەی تایبەتی

دەکەن و" مارناگیـــــان" دەپـــــاڵ داوێـــــن. بەڵام لە جیـــــاتی هـــــاواری پەریشـــــانی و بـــــیقەراری، نـــــاڵەیەکی تـــــێکەڵ بە پێکەنـــــین دێ،هـــــاوارێکی شـــــێتانە. دەرگـــــا دەکەنەوە، مـــــامم لە هـــــۆدە دێـــــتە دەر،بەڵام بە ڕوخســـــارێکی پیـــــر و تێکشـــــکاو مووەکـــــانی ســـــەری لە هەیبەتـــــی خـــــۆف و تـــــرس، دەنگـــــی خوشـــــینی ســـــووت مـــــاری تـــــوڕە کە چاوەکـــــانی خـــــڕی شـــــەڕی لێبـــــاریوو ددانەکـــــانی ژەهـــــراوی هەبـــــووەو لەشـــــی بریتـــــی بـــــووە لە: گەردەنێکـــــی درێـــــژ کە لکـــــاو بە دەرپەریـــــوەک وەکـــــوو کەوچکـــــی ســـــەر گچـــــکە، مـــــامم لە هەیبەتـــــی تـــــرس و وحشـــــەت بە مـــــووی ســـــپی لە هـــــۆدە وەدەردەکەوێ. بە پێـــــی شـــــەرت و پەیمـــــان بۆگـــــام داســـــی بە مـــــامم دەگـــــات. شـــــتێکی وەحشـــــتناک عاجبـــــاتی! مەعلـــــووم نیـــــیە ئەو کەســـــی دوایـــــی ئەو کێبەرکێـــــیە ڕزگـــــاری بـــــووە بـــــاوکم، یـــــان مـــــامم بووە،چـــــونکە لە ئاکـــــامی ئەو ئازمایشـــــە فکـــــری تێکچـــــووە، ژیـــــانی پێشـــــووی خـــــۆی بە تەواوی لە بیـــــر بـــــردۆتەوە و منـــــاڵی خـــــۆی ناناســـــێوەتەوە. لەو روەوە پێیـــــان وابـــــوو کە مـــــامم بـــــووە. ئـــــاخۆ هەمـــــوو ئەو چێـــــرۆکە پەیوەنـــــدی بە ژیـــــانی مـــــن نیـــــیە؟ یـــــان ڕەنگـــــدانەوەیەکی ئەو پێکەنیـــــنە خۆفـــــدارە و ئەم تـــــاقی کـــــردنەوەیە کـــــار تـــــێکەری خـــــۆی لە مـــــن دا نەکردوە و مەربووت بە من نابێت؟؟؟

لەمە بە دوا ئەمـــــن جـــــگە لە نـــــان خـــــۆرێکی زێـــــدە و بیـــــانی شـــــتێکی دیـــــکە نەبـــــوومە: ســـــەر ئەنجـــــام مـــــامم یـــــان بـــــاوکم بـــــۆ کـــــاری ســـــەودا گەری خـــــۆی لە گەل بۆگاداســـــی بـــــۆ شـــــاری ڕەی، دەگەڕیـــــتەوە و ئەمـــــن بە دەســـــتی خۆشکی کە پۆری من بێت، دەسپێرێ.

دایەنەکەم گـــــوتی چـــــاخێ ماڵئـــــاوای، دایکـــــم شووشـــــە شـــــەرابێکی ڕەنـــــگ ســـــووری مەیـــــلەو بنەوشـــــی لە وی

زەهری ددانی ناگ- ماری هندی- تێکەڵ کرا بوو بۆ
من بە پوورم دەسپێرێ. ئاخۆ بوگام داسی چ شتێکی
باشتر لەمەی دەتوانی بە ڕەسمی یادگار و بیرەڤان
بۆ منداڵەکەی بەجێبێڵێ؟ شەڕابی سووری مەیلەو
بنەوش، دەرمانی مەرگ، کە ئاسوسوودەیی ئەبەدی
دەبەخشێ. ڕەنگە ئەویش ژیانی خۆی وەکوو
هێشووی ترێی پشاوتراو، شەڕابکەی بە من
بخشیبوو! لەو زەهری کە باوکمی کوشت. ئێستا
دەزانم چ خەڵات و سەوقاتێکی بە قیمەتی داوە!

ئاخۆ دایکم زیندووە؟ ڕەنگە ئێستا کە ئەمن خەریکی
نووسینم ئەو لە ئولکەی شار، شارێکی دوورە
دەستی هند،لە پێش ڕووناکایی چۆڵەچرا، وەکوو مار
پێچ و پاپۆکە دەخوات و سەما دەکات. وەکوو وەی
مارناگ پێوە دابێت، و ژن و منداڵ و پیاوەکانی
تۆژەرەوەو بە پرسیارو کۆڵەرەوەو ڕووت و ڕەجاڵ لە
دەورەی وی کۆزیلەیان بەستبێت و ئاڵقەیان دابێ، لە
حاڵێکدا کە باوکم یان مامم بە مووی سپی و پشتی
کۆم،لە قەراخ مەیدان دانیشتووەو چاو لە وی دەکات
و بە بیری چاڵەڕەش و دەنگی وشەی و خزینی ماری
تووڕە کەوتووە، کە سەری خۆی هەڵدێنێ،چاوەکانی
بریقە دەدەنەوە، گەردنی کەڤچی دەبێ و خەتێکی
وەکوو چاوێلکە لە پشت ملی بە ڕەنگی بۆری بوڵیل
وەبەر چاو دەکەوێ.

خوڵاسە ئەمن مناڵێکی شیرخۆر بووم کە لە باوەشی
ئەو نەنکی خۆشەویستم دانراوم،و نەنکم کیژی
پوورم،ئەو ژنەی ڕووسپی شیری بە من داوە. و ئەمن
لە ژێر دەستی پوورم ئەو ژنەی بەژن بەرزە کە
مووەکانی بۆری لە سەر نیو چاوانی بوو، لەم ماڵەدا

لە گەڵ کچەکەی- ئەم ڕووسپیە- گەورە بووم. لەو کاتەوە کە خۆم ناسیوە، ئەوم خۆشویستووە. بە ڕادەیەک ئەوم خۆش دەویست کە کچەکەی- هەر خوشکی شیری خۆم- دوایەکان چونکە وەکوو وی بوو، خواستم بووین بە ژن و مێرد. یانی مەجبوور بووم بیهێنم. تەنیا جارێک ئەو کیژە خۆی تەسلیمی من کرد. هیچ کات لە بیر ناکەم. ئەویش لە بن سەری دایکی مردووی بوو.

بەتلێک لە شەو چوو بوو،ئەمن بۆ ئاخرین ماڵئاوای کاتێک کە هەموو دانیشتووی ماڵ دەخەو ڕاچوون بە کراس و بن دەرپێ ڕابووم، بۆ هۆدەی مردوو چووم. بینیم دوو شەمی کافووری لە بن سەری دەسووتێ. قورئانیان لە سەر زگی دانابوو، هەتا شەیتان نەچیتە ناو جەستەو کەلێشەی. پارچەی سەر دەموو چاوم لادا پوورم بەو قەڵافەتە مەتین و بە ویقارەوە بینی. وەک هەموو ئیلاقە و حەزی سەر گۆی زەوی لە ڕوخساری کاڵ ببۆوە. حاڵاتێک کە ئەمنی وادار بە کرنۆش دەکرد. بەڵام لە عەینی حاڵ، مردن بە بۆچوونی من ڕووداوێکی ئاسایی و سروشتی هات.

زەردەخەنەیەکی پاسقاڵی لە قەراخ لێوی وی، ویشک ببوو. ویستم دەستی ڕامووسم و لە هۆدە بچمە دەر، بەڵام کە ڕووم وەرگێڕا بە سەر سوڕمانەوە بینیم کە ئەو لکاتە، کە ئیستا خێزانمە، هاتە هۆدەو لە ڕووو بە رووی دایکی مردوو-دایکی- بە چ هەست و سۆزێک خۆی بە من وەنووساند، ئەمنی بۆ لای خۆی کێشا،ئەمنی چەند جار ماچ کرد! ئەمن لە خەجاڵەتیان دەمەویست ببمە دڵۆپێک ئاوو بە هەردا بچمە خوار. بەڵام چارەم نەبوو. مردوو بە ددانە

ژەنگاویەکانی دەتگوت گەمەمان پێکدەکات. وام بە فکر دا هات کە شێوەی پێکەنینی ئارامی مردوو گۆڕانکاری بە سەردا هاتبوو. ئەمن بێئەوی بمهەوێ ئەوم لە ئامێز گرت و ماچم کرد، بەڵام لەو چرکەیەدا پەردەی هۆدەی قەراخ هەڵدراوەو مێردی پوورم- باوکی ئەو لکاتە- پشت دەر پەڕیو، شاڵگەردن لە مل بەستوو، واردی هۆدە بوو. پێکەنینێکی ویشک و بێ حورمەت و بێزەڵەتی کرد. مووی لە بەدەن ڕاست دەکردەوە. بە جۆرێک کە شانەکانی ڕادەوەشا، بەڵام چاوی لە لای ئێمە نەکرد. ئەمن لە بەر خەجاڵەتی وەخت بوو ببمە تنۆکە ئاو هەرد قووتم دا، و ئەگەر توانیبوامە زلەیەکی توندم لە ڕوخساری مردوو دەدا، کە بە شێوەیەکی گەمەو قومار پیدان لە ئێمەی دەڕوانی. چ ئاپڕوو چوونێک! بە هەراسانی لەم وەتاخە بۆ هۆدەی قەراخ وی دەرپەڕیم.

بەو بۆنەوە ئەو لکاتە، ڕەنگە ئەو کاری جۆر کرد بوو هەتا ئەمن ناچاربم ئەوی بێنم. لە گەڵ ئەوەی خۆشک و برای شیری بووین، و بۆ ئەوەی ئاپڕووی ئەوان نەچێت مەجبوور بۆم ئەوی بێنم. چونکە ئەو کچێکی سەر بە مۆر نەبوو. ئەو بابەتەشم دەزانی. بەڵام ئەمن نەمدەویست بزانم. تەنیا بە گوێچکەی منیان سریواند بوو. هەوەڵ شەوی زاوو بوکێنی چاخێک لە هۆدە، ئەمن و ئەو تەنیا ماینەوە هەر چەند تکام لێکرد،کە خۆی ڕوتکاتەوە جوابی نەدامەوە. دەیگوت "بێنوێژ بوومە" ئەمنی بۆ لای خۆی ئیجازە نەدا. چرای کوژاندەوە چوو لەو لای هۆدە خەفت. وەک مێوژۆکە دەلەرزی، دەتگوت ئەویان لە گەڵ هەژدیهایک لە بیر هاویشتوە. کەس باوەڕ ناکات،

یانی جێگای باوەڕکردن نییە. ئەو هەتا نەیهیشت ئەمن ماچێک لە پیلووی چاویشی بکەم. شەوی دوەمیش ئەمن لە جێگای شەوی ئەوەڵ لە سەر هەرد نوستم، شەوەکانی تریش هەر بەمجۆرە نەوێرام تخوونی بم.

خولاسە سەردەمێک تێپەڕی کە ئەمن لەو لای هۆدە لە سەر هەرد دەڕازام. ئاخۆ کەس باوەڕ دەکات؟ دوو مانگ، نا، دوو مانگ و چوار ڕۆژ دوور لە وی لە سەر زەوی خەوتم و نەمدەوێرا نزیکەی لێبکەم. ئەو پێشدا ئەو دەسماڵەی تەژی لە مانای سازدا بوو، خوێنی کۆتری لە ویدا بوو. نازانم! ڕەنگە هەر ئەو دەسماڵە بوو کە لە شەوی ئەویندار خۆی ڕایگرتبوو و بۆ ئەوەی زۆرتر گەمە بە من بکات. ئەو کات هەموو پێرۆزباییان پێدەگوتم، شاید لە ناو دڵی خۆیاندا دەیانگوت: یارۆ دوێ شەو قەڵای شکاندووە. بە من پێدەکەنین، بە کەڕیتی من دەکەنین. لە گەڵ خۆم پەیمان بەستبوو کە ڕۆژێک هەموو ئەوانە بنووسم.

پاش ئەوەی تێگەیم کە ئەو عەریفی جووت و تاکی هەیە و ڕەنگە بە هۆی ئەمە ئاخوند چەند وشەی عارەبی خوێند بوو ئەوی لە ژێر دەسەڵاتی من نابوو، لە من جاڕزو دڵگر ببوو! ڕەنگە دەیوست ئازاد بێت! شەوێک بڕیام گرت بە زۆرەملی بچمە پاڵی. بڕیارەکەم بە کردەوە هێنایە دی. بەڵام دوایی ئەو هەرا هەراو کێشەمە کێشە، هەستاو ڕۆیی، ئەمن تەنیا توانیم لە ناو نوینووبانی ویدا خۆم ڕازی بکەم،ئەو شەو لە ناو نوێن کە گەرمای لەشی وی لە لەشی من نوغرۆ ببوو، بۆنی وی دەدا نەمدەتوانی بنووم و هەر ئەو کەلەکە ئەو کەلەکەم دەکرد. تەنیا

خەوێکی ئاسوودە کە کردم ئەو شەو بوو. لە دوایی ئەو شەو هۆدەی خۆی، لە هۆدەی من جیا کردەوە.

شەوانە چاخێک کە بۆ ماڵ دەهاتمەوە، ئەو هیچتا نەهاتبۆوە، نەمدەزانی هاتۆتەوە یان نا! لە بنیات نەمدەویست بزانم. چونکە ئەمن مەحکووم بە تەنیایی، مەحکووم بە مەرگ بووم. ویستم بە هەر جۆرێک بێ لە گەڵ کەڵەگانوو عەریفەکانی وی پەیوەندیم هەبێت. ئەمە ئیدی چ کەس باوەڕ ناکات. لە هەر کەسێک کە گوییبیس بووم پێی خۆشبوو، کێشکم دەکێشا، دەچووم هەزار جۆر خوێریەتی، سووک و چرووکی، جلفی، بلحی و پەستی و ڕەزاڵەتم بۆ خۆم پانتاو تەخت دەکرد، لە گەڵ ئەو کەسە ئاشنا دەبووم،کلکە سووتەو، زوان لووسی و، خۆ ڕێکخەری و، دەمتەڕی و،دوو ڕوویی و ماستاو چییەتیم کرد و ئەوم بۆی ساتەری و سوزمانی دەکردو دەهینا، ئەویش چ دەیوزو تاوانکار: چۆلمەگ فرۆش، مامۆستای ئائیینی، جەرگ و دڵ فرۆش، پاسەوان، کەنکەنە چی، فەیلەسۆف، کە ناوو لەقەبی وان تەوفیری دەکرد، هەموو شاگرد سەروپێچک بوون. ئەوانی هەموو پێ لە من باشتر بوو.

بە چ لاساری و یارەمەزی بێحورمەتی پێکردن و گەزارە کێشان خۆم ڕەزیل و گچکەو زەلیل دەکرد! چ کەس باوەڕ ناکات. مەترسیم بوو خێزانم لە دەست بدەم. دەمەویست شیوە ئاکارە و ڕەفتاری، ئیخلاق و دڵڕفێنی لە سووچبارەکانی خێزانم فێربم، بەڵام جاکێشی و قورمساخی دەویت و قوزکەش و قەڵتە و بێناموو سێکی بەد بەخت بووم کە هەموو

ئەحمەقەکـــان بە ڕدێـــنم پێـــدەکەنین. لە بنیـــات دا چلـــۆن
دەمتـــــوانی ڕەفتـــــارو هەڵـــس و کەوت و ئیخلاقـــــی و
کارناشـــیرینی و خۆریـــو تـــۆری و ئـــالۆ و جەلۆکـــان فێـــر بـــم.؟
ئێســـتا دەزانـــم ئەوانـــی خـــۆش دەویســـت، چـــونکە بێحەیـــاو
بێئـــــاپڕوو ئەحـــــــمەق و بەر قەپ و بێـــــزەوەرو گنخـــــاو
بۆگەنبـــــووگ بـــــوون. ئەوینـــــی وی لە بنیـــــات لە گەل
پیســـیوو پـــۆخڵی و قەڕێـــژوو گەنـــدو گەمـــار تـــیکەڵ بـــوو.
ئـــاخۆ بەڕاســـتی ئەمـــن حەزم دەکـــرد لە گەڵ وی بنـــووم؟
ئـــــاخۆ ڕوخســـــاری جـــــوانی بە ڕەواڵەتـــــی وی، ئەمنـــــی
دڵـــداگ و دەڵبەســـتە و ئەڤینـــداری خـــۆی کـــرد بـــوو، یـــان
بێـــزاری وی لە مـــن؟ یـــان ئەداو ئەتـــواری بـــوو، ویـــان حەزو
ئـــیلاقە و ئەویـــن و ئیشـــقێک کە لە منـــاڵی بە دایکـــی ویـــم
هەبـــــوو؟ یـــــان هەمـــــوو ئەوانە دەســـــتیان وێکـــــدابوو؟
نا،نازانم. تەنیا یەک شت دەزانم:

ئەم ژنە ئەم لکـــــــــاتە، ســـــــــــوزمانییە، ئەم ژنە ڕووو
ســـــپییە،ئەم جـــــادووگەرە، ئەم ســـــێحربازە، نـــــازانم چ
زەهـــری لە گیـــانی مـــن،لە هەســـتی و بـــوونی مـــن کـــرد
بـــــوو، کە نەک تەنیـــــا ئەوم دەخواســـــــت،نەتەنیا ئەوم
دەویســـــت، بەڵکـــــوو هەمـــــوو زەڕرەی لەشـــــم، زەڕرەی
لەشـــی وی پێویســـت بـــوو. هـــاواری دەکـــرد کە پێویســـتی
پیـــــیە و ئـــــارەزوێکی تونـــــدم دەکـــــرد کە لە گەڵ وی لە
دووڕگەیەکـــــی بـــــزر بـــــوو،بم کە بەشـــــەر لەو بـــــیەی
نەبـــــووایە، ئـــــارەزوم دەکـــــرد کە بـــــومەلەرزەیەک، یـــــان
بـــاهۆزو بـــاپووک و بـــۆڕان و تۆفانێـــک، یـــان هەورە تریشـــقەو
چەخمـــــاخەو تەشـــــبریق و بڕووســـــکەیەکی ئاســـــمانی،
هەمـــوو ئەو ئـــاڵۆجەلۆیەی کە لە پشـــت دیـــواری مـــاڵەکەم
پشـــــوویان هەڵدەکێشـــــا ودەگەڕان و کەیفیـــــان دەکـــــرد،
هەمـــــووی دەپەقانـــــدنەوەو هەمـــــووی تەفروتونـــــاکرد بـــــوایە،

تەنیا ئەمن و ئەو دەمانیەوە. ئاخۆ ئەوکاتیش هەر گیانلەبەرو بوونەوەرێکی دیکە، مارێکی هندی،یان هەژدیهایەکی لە من بە هێند نەدەگرت و گرنگی پێنەدەدا؟ تاسەو ئارەزووم دەکرد کە شەوێکم لە گەڵ وی تێپەڕاند بوایە، لە ئامێزی یەکتر داباواین و لە باوەشی یەکدا مرد بواین. وام دێتە فکر کە ئەمە ئاکامی بەرزی وجودو ژیانی من بوو. وەکوو ئەمە بوو کە ئەم لکاتە، لە ئەشکەنجەو جەزرەبەی من، حەزو لەزەت دەبات و کەیف دەکات، وەک ئەوەی ئەو دەردەی کە ئەمن دەخوا، بۆی بەس نەبووە.

خولاسە ئەمن لە کارو جولانەوە کەوتم و خانەنشین بووم- وەکوو مردوەک. هیچ کەس لە ڕەمزو ئاچەری کرانەوەی نهینەکانی ئێمە خەبەری نەبوو. دایانەکەم پەێچەرمووویەکی پیرو کەنەفت و کەلالە بوو کە ئامپیاڵەو ئاو دەم و ئاو دەنگ و خەمڕەوێن و هەڤنشینی مەرگی بڕە بڕەو تۆزە تۆزەی من ببوو، ئەمنی سەر کۆنە دەکرد. بە هۆی ئەو لکاتە،لە پشت سەرم،دەورو پشتی خۆم دەبیست کە لە گوێچکەی منیان دەسپریواند: ئەم ژنە هەژارو فەقیرە چلۆن خۆی لە کەڵ ئەو مێردە شێت و جڕپن و دیوانەیە باشار دەکات، دیارە تاقەت و تاوش و تەحەموڵ و وتابشت و پشوو درێژیکی زۆری هەیە. حەق بە وان بوو،چونکە هەتا ئەو دەرجەو پلەیە کە ئەمن زەلیل و بەر چەپۆک و بێدەسەڵات بم، باوەڕ نەدەکرا.

ڕۆژ بە ڕۆژ کزو زەعیف و ڕەنگ پەڕیوەوە دەبووم، کە خۆم لە ئاوێنە چاو لێدەکرد، کولمەکانی سوورو ڕەنگیم وەک گوشتی دووکانی قەساوی بوو. لەشم تەژی لە گەرما و چاوەکانم شیوەی خومارو خەماویان

به خۆوه گرتبوو. لەم حاڵاتەی نوویی خوم کەیفم دەکرد و له چاوانم تۆزو خۆڵی نەگبەتی و تۆزی مەرگ و مردن بینی بوو- بینی بووم که دەبێت بڕۆم.

له ئاکدامدا حەکیم باشیان ئاگا دارکرد- حەکیمی ئەلۆ جەلۆکان،حەکیمی بنەماڵە، که به قەولی خۆی ماری مەزن کرد بوو- به مەندیل و شیرو شەکەر و سێ وەجەب ڕدین وارد بوو. ئەو خۆی به سەر بەرز دەزانی و شانازی به خۆ دەکرد که دەرمانی قوەتی بای به باپیرم داوە، خاکه شیرو نەباتی له ئەوک و تینتینۆکەی من کردوە، فلووسی له نێوکی پوورم بەستووه. خولاسه کاتێک هات له سەر باڵنج دانیشت نەبزی دەستی من گرت، چاوی له زوانی کردم، شیری کەرێ و مەعجون بخۆمەوە، و ڕۆژێ دوو دان بخوری کندرو زرنیخم بدەنێ. چارەنامەیکی دووروو درێژی  وه دایانەکەم دا، که بریتی بوو له: گوڵاوەکان و ڕۆنی دەسەیرو سەمەڕە وەکوو: زەیتوون،ڕوبی سووس، کافوور،پەڕی سیاوەشیان،ڕۆنی بابونە،ڕۆنی قاز، تۆوی کەتان،تۆوی سنەوبەر و خەڕافاتی دیکە.

حاڵم خەرابتر ببوو،تەنیا دایانەکەم- که دایانی ویش بوو- به ڕوخسارێکی پیرو کەڵالەو مووی ده بۆری، له قولینچکی هۆدە، له بن سەری من دادەنیشت، ئاوی ساردی له نێواچاوانم هەڵدەسووت و کۆڵاوەکانی بۆ دەهێنام. له حاڵات و ڕوداوی منالی من و ئەو لکاته قسەی دەخوێنێ وەردەدا. بۆ نموونه به منی گوت: که خێزانم له ناولانگ ئالوده به نێنووک جوتن بوو، دایم و دەرهەم نێنوکی دەستی چۆپی خۆی دەجووت، به ڕادەیەک دەکڕووستەوە که بریندار دەبوو، جاری

واشبوو چێرۆکی بۆ دەگێڕامەوە. وای بۆ دەچم کە ئەو قسانە تەمەنی منیان بۆ پشتەوە دەگێڕاوە، حالاتی منالی لە من دا دەژیاوە- چونکە پەیڤینەکانی پەیوەندیان بە سەردەمی مندالی من بوو، ئەمنی بۆ ئەو دەوران دەبردەوە، کاتێک کە زۆر گچکە بووم و لەو هۆدەیەی کە ئەمن و خێزانم لە ناو لانک لە قەراخ یەکتر نوستبووین- لانکەکی گەورەی دوو کەسی. دورست دێتەوە بیرم، ئەم قسانەی دەگێڕاوە. ئێستا بازێک لەو ئاخافتنانە کە ئەو کات باوەڕم نەدەکرد، هەنووکە  بۆمن بۆنەتە ئەمرێکی سروشتی.

چونکە نەخۆشی دونیای تازەی لە من دا وەدیهێنا، دونیایەکی نەناس و نامۆ، نائاشنا و ناس نەکری،بن بڕبوو ئەجکاندراو، تەژی لە وێنەکان و ڕەنگەکان و ئارەزو ئێشتیاو مگێز، کە لە حالاتی ساخی و سەلامەتی، ناکرێ فکری لێبکەیەوە، و هەراو هورای ئەم پلارو شاتاڵ و لاتاوو قسەی بە توێکولم بە کەیف و پریشانیەک کە شایانی گوتن نییە لە خۆمدا هەست پێدە کرد، هەستم پێدەکرد کە بۆتمەوە مناڵ،هەر ئێستا کە خەرێکی نوسینم لە هەستی دەروونی و ئیحساسات بەشداری دەکەم، هەموو ئەو هەستی هەناو پێوەلکاو پەیوەندار بە هەنووکەیە و مالی ڕابردوو نییە.

وەک دەڵێن ئاکار ئەڵسوو بنیش، هزرەکان،تاسەو ئارەزوەکان و خوو خدەو،شیوازو عادەتی خەڵکانی پێشوو، کە بە هۆی ئەم مەتەڵانە بە بنەچەکەو بەرەباب و تۆرەمە ڕەچەڵاک دوایی گویزراوەتەوە، یەکێک لە واجباتی ژیان بووە.

هەزاران ساڵە کە ئەم قسە و پەیقینە گوتراوە، ئەم دەست تێکەڵیانەیان کردوە، سەر جێێیان کردوە، ئەم ئاڕووشەی منداڵانەیان هەبووە. ئاخۆ سەرانسەری ژیان قسەکی گەمە و پێکەنین، مەتەڵێکی باوەڕ نەکردوو ئەحمەقانە نییە؟ ئاخۆ ئەمن ئەفسانەو چێڕۆکی خۆم نانووسم؟ پەیقین تەنیا ڕێگایەکی هەڵاتن و دەربازبوون بۆ ئارەزوکانی بە مراد نەگەیوە.

ئەو تاسەو ئارەزوانەی کە بە وی نەگەیون. ئارزوەکانی هەر مەتەڵ دورستکەرێک وەکوو ورەی سنووردارو کەلەپووری و میراتی خۆی فکر لێکردۆتەوە. خۆزیا و سەت خۆزگە، توانیبوامە وەکوو سەردەمێک کە منداڵ و ئاپتەرو بڵح و بێچێک و بێمێشک و پەخمەو گەوج و نەزان بووم، لە سەرە خۆ بخەفم. خەوێکی ئارام و ڕاحەت و بی ئاخ و ئۆف و پەککوو مخابن و داخ و حەسڕەت و کول و دەرد و دەغدەغە.

کاتێک وەخەبەر دەهاتم سەر کوڵمەکانم،گۆناکانم بە ڕەنگی گۆشتی پێش دووکانی قساوی سوور ببوو. لەشم گەرم بوو، دەکۆخیم - چ کۆخەیەکی قوول و مەترسیدار؟ کۆخەیەک کە مەعلووم نەبوو لە کام بیرو قپکەوکۆرتاڵ وگاچاڵ قوڵک وکەنداڵی بزربووی لەشم دێتەدەر! وەکوو کۆخەی بارگینەکان کە بەری بەیانە خێرا جەندەکەی پەزو بەردیل و شەک و کاوڕو بەران بۆ قەساو دێنن.

بە باشیم وەبیردێ، هەوا بە تەواوی تاریک بوو، چەند دەقیقە لە حاڵی لە خۆچوون بیهۆشی دابووم، بەر لە وەی خەو لە گەڵ خۆم بەرێ، لە گەڵ خۆم قسە

دەکرد. لەو وەختەدا هەستم پێدەکرد کە ببوومەوە منداڵ و لە لانگ دا خەوتبووم. هەستم پێکرد کەسێک لە لای منە. لە مێژ بوو دانیشتوانی ماڵ هەموو خەوتبوون. نزیکەی تاریکوو ڕوونی بەیانی بوو، بیمارەکان دەزانن لەم وەختە وەکوو وەیە کە ژیان لە سنوورو حەدوو سەت و کەوشەن و تخووبی دونیا دهێنرێتە دەر. دڵم بە توندی  و تەپ، تەپ لێیدەدا بەڵام نەدەترسام، چاوەکانم کراوە بوو، بەڵام کەسم نەدەدی،چونکە تاریکی گەلێک ئەنگوست لە چاوو بڵاو بوو.

چەند دەقیقە تێپەڕی، فکرێکی ناخۆشم بۆ هاتە پێش، بەخۆم گوت: ڕەنگە ئەو بێت. لەم چرکەیەدا هەستم پێکرد دەستێکی فێنک لە سەر نیوچاوانی سۆژاوم دانراوە. لە پاڵخۆدا لەرزیم،دوو سێ جار لە خۆم پرسیار کرد: ئاخۆ ئەمە دەستە پێمرد و عزرائیل نەبووە؟ سبەی کە وەخەبەر هاتم، دایانم گوتی:کیژەکەم (مەبەستی خێزانم،یانی لکاتە بوو) هاتبوو بۆ بن سەری تۆ و سەری تۆی لە سەرلاقی خۆ دانابوو، وەک منداڵان ڕایدەژاند. گویا هەستی پەرساری دایکم لە ویدا وەخەبەر هاتبوو. خۆزیا لەو چرکەدا دەمردم. ڕەنگە ئەو منداڵەی کە وەزگی کەوتبوو، مردوە! ئاخۆ منداڵی وی پێی لە دونیا نابوو؟ ئەمن نەمدەزانی.

لەم هۆدەدا کە هەر چرکە لەبۆ من تەنگترو تاریکتر لە قەبر دەبوو، دایم و دەرهەم چاوم لە ڕێگای خێزانم بوو، بەڵام ئەو هیچ کات نەدەهات. ئاخۆ لە دەستی وی نەبوو کە تووشم بەو ڕۆژە هاتبوو؟ قوماری پێناکرێ، سێ ساڵ،نا،دوو ساڵ و چوار هەیڤ بوو،

بەڵام ڕۆژ ومانگ چییە؟ بۆ من مانای نییە، بۆ کەسێک
کە لە قەبر دایە زەمان بێ مانایە. ئەم هۆدە،
گومبەزی ژیان و هزرەکانی من بوو. سەرجەمی
هەڵات بیرەو بە وێدا، سەر جەمی دەنگەکان و
هەموو خۆنیشاندانی زیوار خەڵکان، ژیواری ئەلۆ
جەلۆیەکان کە هەموو بە جەستەو بە گیان یەک جۆر
دورست کراون بۆ من سەیرو بێ مانا ببوو.

لەو کاتەوە کە نەخۆش ببووم و لە ناوجێو بان
کەوتبووم لە دونیایەکی ئاوارەیی و بیانی و ئاراگیلی
و غەوارەیی و هەتەڵەو هەڵوەدایی باوەڕ نەکراوە
وەخەبەر هاتبووم، کە ئاتاجیم بە دونیای ئەلۆجەلۆکان
نەبوو. دونیایەک کە لە خۆمدا بوو،دونیایەکی تەژی و
دارماڵ و لێپاڵێپ لە ڕێنەزانراو و نەبینراو نەناسراو،
وەکوو ئەمە بوو کە ناچارو مەجبوور بووم هەموو کون
و کاژێری سنبەکانی وی بە لێپرسینەوەو پێراگەیشتن
و مشوور لێخواردن و سەنگ و سووژن بکەم
وبپشکنمەوە.

شەو کاتێک کە بیەی من لە تخووب و سنووری دونیا
قەڵبەزەی فڕیدەداو ئاقزین و شەپۆڵی لێدەداو مۆنج و
مەوج دایگرتبوو، کەمێک پێشتر لە دەقیقەیەک لە
خەونێکی قووڵ و خاڵی قوم ببووم، خەونم دەدی. لە
چرکەو چاو لێکدانێک، ئەمن ژیانێکی دیکەم جگە لە
ژیانی خۆم دەست پێکرد بوو،لە هەوایەکی دیکە
هەناسەم هەڵدەکێشا و دوور بووم. وەک وەی کە
دەمەویست لە بەر خۆم ڕاکەم و هەڵێم و چارەنووسم
بگۆڕم. چاوم کە لە سەر یەک دادەنا،دونیای واقعی و
بەڕاستی خۆم دەرگای بۆم دەکراوە. ئەو فکرو
خەیاڵانە ژیانێکی تایبەت بە خۆیان هەبوو، ئاسەوار

بــڕاو بــوون و ئەجکــاو بنبــڕ بــوو تێکــوو پیکچــوون و داغــان و ڕیشــە کێشــبوون ســەر لە نــوێ وەدەردەکەوتــن و دیاریــان دەدا. وەک ئەوەی ئێــرادەی مــن لە وانــدا کــار تــێکەر نەبــوو. بەڵام ئەم بــابەتە بە بێــدرۆ زانــین و بە بێگومــانزانین و مســوگەر دەرچــوونیش نیــیە. تەماشــاگەیەک کە لە بەر چــاوی مــن جەســتەی هەبــوو، خەونێکــی ئاســایی نەبــوو، چــونکە ئەمــن هیچتــا خەوم وێنەکەوتبوو.

ئەمــن لە حــاڵی ســکووت و بێــدەنگی و خامووشــی و کپــی وقــوروقەپ و ئــارامبوون، ئەو خەیاڵاتــانەم لە یەکتــر بــڕ دەدان  و جیــا دەکــردنەوە و دەئــاوارتن و دادەبــڕین لێکهەڵــداوارد و لە گەڵ یەکــم بەراوردو تەخمــین و ســەنگ و ســوک دەکــردو دەقەبلانــدو هەڵدەســەنگاند. وای بــۆ دەچــووم کە هەتــا ئەو چــاخە خــۆم وەک پیویســت نەناســیبوو،دونیایەکی ئەمجــۆرە کە هەتــا ئێســتا خەیاڵیشــم نەدەکــرد مانــا و مەفهــوم و تابشــتی خــۆی لە دەســت دابــوو و لە شــوێنی تاریکــانی شــەو حــوکمڕانی و فەرمــانڕەوایی هەبــوو- چــونکە ئەمنیــان فێــر نەکــرد بــوو کە چــاو لە قەڵافەتــی شــەو بــکەم و شــەوم خۆش بوێت.

ئەمــن نــازانم لەم کــاتە ئــاخۆ باســکم لە ژێــر حــوکم و فەرمــانی مــن بــوو، یــان نــا،! گومــانم دەکــرد ئەگەر دەســتم لە ئیختیــاری خۆمــدا نــابوایە، بە هــۆی دنە دانێکــی نــامعلوم و ناشــوناس نەبینــراو ژبەر خــۆو لە خــۆیەوە وەکــار دەکەوت، بێــئەوەی بتــوانم لە جــولانەوی وی تــداخوڵ بــکەم و دەســت تێــوەردانم هەبێــت. ئەگەر دایــم و دەرهەم ئاگــاداری هەمــوو لەشــم نەکردبــوایە، بــێ ئیــرادە ئاگــاداری ئەو نەبــووم، دەیتــوانی و دەشــیا

زۆرکـــــاری لـــــێ واقــــع بــــن کە چـــــاوەڕوانم نـــــدەکرد. ئەم هەســــت و ئیحساســــە ســــەردەمێکی دووروو دەرێـــژ بـــوو لە مــــن دا وەدیهـــــاتبوو، کە بە زینـــــدوویی، لێـــــک پــــڕش و بـــــڵاو کــــوت، کـــــوت و، لەت، لەت دەبـــــووم. نەک تەنیـــــا کەلەش و جەســـــتەم، بەڵکـــــوو گیــــانم ،رووحــــم، دایـــــم و دەرهەم لە گەڵ دڵـــــم جیـــــاوازی و تەوفیــــری هەبـــــوو، و لە گەڵ یەکتــــر ســــەری رێکەوتــــن و ســــازیش و ئاشــــتیان نەبــــوو. دایــــم و دەرهەم جۆریــــک بە تـــــاڵکردنەوەو بڕبـــــڕ کـــــردن وبەش بەشــــکردن و جـــــوداکردنەوە دابەشـــــینێکی عەجایـــب وغەڕایـــبم ڕێـــدەبڕین. جـــار وابـــوو فکـــری شــــتێکی ئەوهـــام دەکـــرد کە هەتـــا بۆخـــۆم نەدەمـــدەتوانی بــــاوەڕ بـــکەم. جـــــار هەســــتی بەزەی یپیـــــداهاتن و بـــــۆرین و بەشـــین و بەخشـــین و چـــاو لێپۆشـــین لێبـــوردن لە مـــن دا وەدیـــــدەهات، لە حاڵێکـــــدا ئاقـــــڵ و ئـــــاوەزم، ئەمنیــــان بە تـــانەو تـــوانج و تەشـــەر ســـەر کـــۆنە دەکـــرد. زۆر جـــار کە لە گەل کەســـێک دەئاخافتم،یـــان کـــارێکم دەکـــرد، ســـەبارەت بە بـــــابەتی جۆراجـــــۆر، دەچـــــوومە نـــــاو قســـــەکانیان، لە حاڵێکـــــدا زەیـــــن و هۆشــــم لە شــــوێنێکی دیـــــکە بـــــوو، لە فکـــری خـــۆم دابـــووم و لە نـــاوەخۆمەوە ســـەر کـــۆنەی خـــۆم دەکرد.

کـــۆمەڵە فکـــرو هزرێـــک لە حـــاڵی بـــاتڵبوون و بنبـــڕ بـــوون و لێـــــک پچـــــڕان و تەفروتونــــــا بــــوون بـــــوو. وەک دەڵـــــێن هەمیشــــــە ئەوهــــــا بــــــوومە و دەبـــــم- تێکەڵبــــــوونێکی نــــاڕیکوپێکوو ســــــەیرو ســــــەمەرە... شــــــتێک کە باشـــــــار نەکـــــراو بە دەر لە تابشــــت و تـــــاقەت بــــوو، هەســــتم دەکـــــرد لەو هەمـــــوو خەڵـــــکە کە دەمبیـــــنن و لە نــــاو وانـــــدا ژیـــــان دەکەم، دوورم بەڵام ویکچــــــــــــوونەکی ڕەواڵەتـــــــــــــی، وەێکچـــــــوونەکی بنبـــــڕ و دوور لە عەینـــــی حـــــاڵ نزیــــک،

ئەمنـــــی بە ئەوان دەلکانـــــد. ئەمە پێداویســـــتی و ناگوزیریەکـــانی هاوبەشـــی ژیـــان بـــوو کە لە ســـەر سوڕمان و واق وڕمانی منی کەم دەکردەوە.

وێکچونێـــک لێچوونێـــک کە زۆرتـــر لە هەمـــوو ئەمنـــی جەزەرەبە دەکـــــردو زەجـــــر دەدا، ئەمە بـــــوو، کە ئەلۆجەلۆکـــانیش وەکـــوو مـــن لەم لکـــاتە- خێـــزانم- خۆشـــیان دەهـــات، ئەویـــش بەوانـــی زۆرتـــر مەیـــل و ئـــارەزوو هەبـــوو. لـــێم یەقیـــنە کە ئیـــرادو کەمووکـــوڕی لە وجودی یەکێک لە ئێمە بووە.

نـــاوم لکـــاتە(جانـــەو ســـوزمانی و ســـەڵیتە) نـــاوە، چـــونکە چ ناوێـــک بەو باشـــیە لێـــی نەدەوەشـــاوە. نـــامهەوێ بڵـــێم خێـــزانم، چـــونکە خاســـییەتی ژن و مێردایەتـــی لە مـــابەینی ئـــێمە بـــیەی نەبـــوو، و لە گەڵ خـــۆم درۆ دەکـــرد. ئەمـــن دایـــم و دەرهەم لە ڕۆژی بەرێ، نـــاوی ویـــم لکـــاتە نـــاوە، بەڵام ئەم نـــاوە کێشـــێکی تـــایبەت و ناخـــازای هەبـــوو، ئەگەر ئەوم هێنـــا،لە بەر ئەمە بـــوو کە ئەو ســـەرەتا ویســـتی خـــۆی بـــۆ لای مـــن دەربـــڕی،ئەویش لە ئـــاین و ئـــۆین و تەڵەکە بـــازی و مەکـــر و فێـــڵ و فەنـــدەکەی بـــوو. دەنـــا چ ئیلاقەیەکـــی بە مـــن نەبـــوو. هەر لە بنیـــات چلـــۆن ئیمکـــانی هەبـــوو ئەو حەز لە یەکێـــک بکـــات و بە کەســـێک ئـــیلاقە پەیـــدا بکـــات و مانـــای خۆشەویســـتی و دۆســـتایەتی و ئەویـــن و ئەوینـــداری بزانێـــت؟ ژنێکـــی هەوســـباز پیـــاوێکی بـــۆ شـــاوەتبازی،یەکێک بـــۆ حەکەداری و و یەکێـــک بـــۆ ئەشـــکەنجە و جەزرەبەدان دەوێت.

گومـــان نـــاکەم کە ئەو بە ئەمەشـــی بەس دەکـــرد! بەڵام ئەمنـــی بێگومـــان  بـــۆ ئەشـــکەنجە هەڵبژاردبـــوو،لە

ڕاســـــــتیش دا لەمە باشـــــــتری نەدەتـــــــوانێ هەڵبیژێـــــــرێ. بەڵام ئەمـــــــن بـــــــۆیە ئەوم هێنـــــــا، چـــــــونکە وەدایکـــــــی دەچوو،چـــــــونکە وێکچـــــــوونێکی بنەبـــــــڕو دووری لە گەڵ خـــــــۆم هەبوو.

ئێســـــــتا ئەوم نەک تەنیـــــــا خۆشدەویســـــــت،بەڵکوو هەمـــــــوو زەڕرەی لەشـــــــــــم ئەوی دەویســـــــــت. بە تـــــــــایبەت بەدەنم،چـــــــونکە نـــــــامەوێ ئیحساســـــــات ڕاســـــــتی و ڕاســـــــتەقینە لە بـــــــن لەفـــــــافەی خەیـــــــاڵی ئەویـــــــن و ئـــــــیلاقەو حـــــــیکمەت و زانســـــــتی ئیلاهـــــــی بشـــــــارمەوەو حاشـــــــاردەم.( هوزوارشـــــــن) ئەدبـــــــی بەزارم چەژو تـــــــام نـــــــاگەیێنێ. فکـــــــرم دەکـــــــرد کە چەشـــــــنە ورشـــــــە - یـــــــان جـــــــۆخینەیەک کە لە ســـــــەر ئەنبیـــــــاو ئەولیـــــــا دەبینـــــــدرێ، لە لەشـــــــم دا شـــــــەپۆلی لێـــــــدەدا و جـــــــۆخینەی نێـــــــوان لەشـــــــــی وی ڕەنـــــــگە جـــــــۆخینەیەکی کـــــــزو دەروون پـــــــیس بەد تـــــــوخم و تـــــــۆرەمە خەراپ و ناڕەســـــــەن و ناکەســـــــی بێمـــــــاری دەوێســـــــت و بە تەواوی قودڕەت بۆلای خۆی ڕەکێش دەکردو دەیکێشا.

حـــــــاڵم کەباشـــــــبوو بڕیـــــــارم گـــــــرت بڕۆم،بـــــــڕۆم خـــــــۆم ون کەم- وەکـــــــوو ســـــــەگێکی خـــــــۆرە گرتـــــــوو کە دەزانـــــــێ کە دەبـــــــێ بمـــــــرێ، وەکـــــــوو باڵنـــــــدەکان کە چاخێـــــــک مەرگ لێیـــــــان نزیـــــــک دەبیتەوە، خۆیان ون دەکەن و وەدەشێرن.

بەیـــــــانی زوو لە جـــــــێ رابـــــــووم، دوو کـــــــولیچە کە لەســـــــەر ڕەفحەبـــــــوو هەڵگـــــــرت و بە جۆرێـــــــک کە کەس ئاگـــــــادار نەبێـــــــت لە مـــــــاڵ بـــــــۆی دەرچـــــــووم و هەڵاتـــــــم، لە دەســـــــت ئەو نەکبەتیـــــــیەی کە ئەمنـــــــی گرتبـــــــوو هەڵاتـــــــم، بەڵام بـــــــێ ئەوەی بـــــــزانم دەچمەکـــــــوێ؟ لە نـــــــاو گەڕەک و کۆچەکانـــــــدا! بـــــــێ تکلیـــــــف و ســـــــەرگەردان لە نـــــــاو ئەلۆوجەلۆکـــــــان، هەمـــــــوو ئەوانەی بـــــــیچم و پـــــــۆتەراک و بەچـــــــک و تەرح و

دیـــدارو پـــارو بژێـــرو چـــاو تەنـــگ و بەغیـــل و چـــاو چنـــۆک و
چـــــرووک و چـــــاوی تواحکاریـــــان هەبـــــوو وەدوای پـــــارەو
ناوبانـــگ کەوتبـــوون، تێـــپەڕیم، ئەمـــن ئاتـــاجیم بە بینینـــی
ئەوان نەبـــوو، چـــونکە یەکیـــک لەوان نـــوێنەری ئەوانـــی تـــر
بـــوو. هەمـــوو لە زارێکیـــان تفیبـــوو کە لۆچیـــک ڕەیخەلـــۆکە
بە دواوی یەکـــــدا هەڵاوســــــراو ســــــەری دیـــــکەی
دەگەیشتەوە ئەسپابی نێرینەو مێوینەکەیان.

لە ناکـــاو هەســـتم کـــرد کە زرەنـــگ و تونـــدو تۆڵـــوو چـــالاک و
ســـــووکتر بـــوومە، ماســـــوولکەکانی قاچەکـــانم بە تونـــدی و
شـــــیوەکی تـــایبەت کە نەمـــــدەتوانی چـــاوەڕوانی بـــــکەم
وەڕێکەوتبـــــوو. هەســـــــتم کـــــرد کە لە هەمـــــوو داوو
بەنـــدەکانی ژیـــوار ڕزگـــاریم پەیـــدا کـــردوە و نەجـــاتم بـــووە.
شـــانم هەڵتەکانـــدن،ئەمە جـــوڵانەوی سروشـــتی مـــن
بـــوو، لە منـــــداڵی هەر کـــات لە ژێربـــــاری قورســـــی
ئاڕووشـــەو زەحـــمەت و بەرپرســـایەتی ئـــازاد دەبـــووم ئەمە
ئاکارەو ڕەفتارم ئەکرد.

ڕۆژ هەڵدەکشـــــــا، دەیســـــــوتاندو دەیســـــــوژاند. لە
کوچەکـــانی بیـــدەنگ و خڵـــوەت کەوتم،ســـەر ڕێگـــام
ماڵەکـــانی ڕەنـــــگ خـــــۆڵە پـــــۆتینە بە شـــــکڵی
هەندسی،ســـەیرو ســـەمەرە- چـــوار قولینچـــک، شـــەش
لایەن، قـــــویج،- بە لابـــــاجەی دە کـــــورت و تاریـــــک
دەبینـــــدران. ئەو دەریچـــــانە بـــێ دەرک ودەروازە،بـــێ
خـــاوەن و ئامـــانەتی وەبەر چـــاو دەکەوتـــن. وەکـــوو ئەمە
بـــوو کە هـــیچ کـــات گیانـــدارێک نەیتـــوانی بیـــت لەو مـــاڵانەدا
دانیشتنی هەبووبێت.

ڕۆژ چەشـــــنی شمشـــــیری تیـــــژی زێـــــڕاوی لە قەراخ و
قوجـــاخی ســـێبەری دیـــواری دەبـــڕی و دەتاشـــی و

لێـــــــدەکردەوەو هەڵـــــــدەگرت. کۆچەکـــــــان لە نێـــــــوان دیوارەکـــانی کـــۆنەی ســـپی کـــردوو درێـــژ دەبـــوونەوە، هەمـــوو شـــوێنێک ئاســـودە ئـــارام و کـــپ و بێـــدەنگ و لاڵ و بێـــزوان بـــوو، وەکـــوو ئەمە هەمـــوو عناصـــر یاســـای مـــوقەدەس و ممبـــارەک ئارامشـــی هەوای ســـوژیاگ- یاسای کپ و بیدەنگیان- لە بەر چاو گرتبوو.

بە نەزەر دەگەیـــی کە لە هەمـــوو شـــونێک بەرپێـــواری و داپۆشـــراو نهینـــی بـــوو ،بە جۆرێـــک ســـپیەلاکەکانم قـــودڕەتی هەناســـە هەڵکێشـــانیان نەبـــوو. لە ناکـــاو بەخـــۆم زانـــی کە لە دەروازە وەدەرکەوتـــووم. گەرمـــای خـــۆر لە گەڵ هەزاران  دەمـــی هەڵمژیـــوو ئـــارەقەی لەشـــی منـــی دەکێشـــا دەر. گەڵاو بنچـــک و بـــڕکەی ســـارا لە ژێـــر خـــۆری تیشـــک هـــاوێژ بەڕەنگـــی زەردەچیـــوە گۆڕابـــوون. ڕۆژ وەکـــوو چـــاوی نەخـــۆش گەنـــدەتای لێبـــوو،گزنگی ســـوژیاوی خـــۆی لە میچـــی ئاســـمان بەسەر تەماشاگەی کپ و بیدەنگ وبێگیان دەپرژاند.

بەڵام زەویـــن و گیاکـــانی ئێـــرە، بـــۆنی تـــایبەتی هەبـــوو، بـــــــۆنی وی بە ڕادەیەک بە هەرەکەت بـــــــوو کە لە هەڵمژینـــی وی وەبیـــری ســـاتەکانی ســـەردەمی منـــاڵی خـــۆم کەوتـــم. نەک تەنیـــا جـــولانەوە وشـــەکانی ئەو زەمـــانی هێنـــامەوە بەر چـــاو، بەڵکـــوو چـــرکەیەک ئەو ســـەردەمم لە خۆمـــدا هەســـت پێکـــرد، وەکـــوو وەی کە دوێنێ قەوما بوو ڕوویدا بوو.

جۆرێـــک ســـەرەگێژەی پێخۆشـــبوون، بـــۆم هـــاتە پـــێش، وەکـــوو ئەوەی ســـەر لە نـــوێ لە دونیـــایەکی بزربـــوو لە دایـــــک بـــــووم. ئەم هەســـــت و ئیحساســـــە تایبەتمەنـــدیەکی مەســـت و ســـەر خـــۆش هێـــنەری

هەبوو، وەکوو شەڕابی کۆنی شیرن لە دەمارو
ڕەگەکانی من هەتا بنەبانی لەش و بیەی کارتێکەری
کرد.

لە سارا دڕک و داڵ،ورکە خیزو بەردەڵان، بەژن و قەدو
باڵاو ساقەتەی دارەکان و بڕک و پنچ و بنچکی
گچکەی کاوکوتم دەناسی، بۆنی سەوزایەکانی
خۆماڵیم دەناسی، وەبیر ڕۆژەکانی دوورە دەستی
خۆم کەوتمەوە، بەڵام هەموو ئەو بیرەڤانانە بە
شیوەکی چەشنە ئەفسوون لە من دوور کەوتبوون و
ئەو یادگارایانە پێکەوە ژیانێکی سەر بەخۆیان
هەبوو،لە حاڵێکدا کە ئەمن شایەدێکی دوورو فەقیرو
دەستە وەستان و هەژار زێدە نەبووم و هەستم پێدە
کرد کە لە نێوان ئەمن و ئەوان گێژاوێکی قووڵ
هەڵکەندرا بوو. هەستم دەکرد لە ئەمڕووەوە دڵم
خاڵی و بەتاڵە، پنج و عەتری جادویی ئەو سەر دەمم
ون کرد بوون، دارەکانی شەنگەبێ، زۆرتر نێوانیان
پەیدا کرد بوو، مابەینیان زێدەتر ببوو، بڕکەو بنچک
ویشکتر بوو. گیان لە بەرو بونەوەرێک کە ئەوکات بوون
ئیدی بیەی نەبوو و ئەگەر حازریشم دەکرد و لە
گەڵی دەئاخافتم نەیدەبیست و بابەتەکانی منی فام
نەدەکرد و تێنەدەگەیی. قەڵافەت و ڕوخساری بیەی
ئادەمێکی هەبوو کە پێشتر لە گەڵ وی ئاشنا ببووم،
بەڵام لە من و بەشێک لە من نەبوو. دونیا بە نەزەرو
چاو لێکردنی من، ماڵێکی چۆڵوو هۆل و بەتاڵ و
عەتاڵ و خەماوی بوو، لە سینگەمدا پەریشانی
بێقەراری و دڵپەشیوی دەوری لییدەدا،وەکوو ئەوەی
ئێستا مەجبوور بووم بە پێ پەتی و پێخواسی و
ڕووت، سەر لە هەموو هۆدەکانی ئەو ماڵە بدەم

بەسەر جەمیان ڕابگەم و چاو لە هەموانیان بخشێنم. لەو هۆدانەی جمک و دەباڵیکدا تێدەپەڕیم، بەڵام کاتێک دەگەیمە هۆدەی دەوایین، لە بەرابەری لکاتە قەرارم دەگرت درگاکانی پشت سەری من بە شێوەکی خودکار بۆخۆیان گاڵەدەدرا، تەنیا سێبەرەکانی ڕاژاوەی ئەو دیوارانەی کە قولینچکەکانیان بنەبڕ بوون چەشنی غولامان و کەنیزانی پێست ڕەش لە دەورەی من پاسەوانیان دەداوکێشکیان دەکێشا.

کە گەیمە نزیکایی "چەمی سورن" لە پێشم چیایەکی ویشک و زورکوو قاقڕو چۆل دیاری دا. هەیکەلی ویشک و ڕەقی کێو ئەمنی وەبیری دایانم خست، نازانم چ پەیوەندیەک لە نێوان ئەوان وجودی من هەبوو! لە قەراخی چیا تێپەڕیم، لە دایرەکی گچکە خۆش ئاوو هەوا کە کێوەکان دەورو بەریان گرتبوو،فەڕەشی زەوی تەژی و دارماڵ لە بڕکەو پنچ وبنچک گوڵی نیلوفەڕی مەیلەو سوور بوو، بە شیوەیەک کە هەردی داپۆشیبوو،لە ترۆپی چیا و قەڵایچەیەکی بەرز کە بە خشتی وەزنەدار وقورس دورست کرا بوو دەبیندرا.

لەم کاتە هەستم بە شەکەت و کفتی و ماندوەتی کرد. چوومە قەراخ چەمی سورن، لە بن سێبەری دارێکی کۆنی شەنگەبێ، لە سەر خیزەڵان دانیشتم. شوێنێکی بێدەنگ و کپ و چۆل و قەپوقڕو دەولە قووچ و بیهەست و ئارام بوو. لە ناکاو ئاگادارو خەبەردار بووم و بینیم لە پشت دارەکانی شەنگەبی کێژۆڵەیەک هاتە دەرو بۆ لای قەڵایچەکە چوو. جلووبەرگی ڕەشی پۆشیبوو کە بە پۆو ڕایەڵی زۆر

ناسک و سووک بە ئاوریشمی چنرا بوو. نێنووکی
دەستی چەپەی دەجووت و دەمژت و بە
جوڵانەوەیەکی ئازادانەو بێ بە هێند گرتن دەخوشی
و ڕەت دەبوو. وام بە زەین داهات کە ئەوم بینی بوو،
دەمناسی. بەڵام لەو مابەینە دوورە لە ژێر تیشک
وگزنگی خۆر بۆم نەکرا هەڵێهاوێرم کە چلۆن
یەکجارەکی لە بەر چاوم ون بوو!

ئەمن لە سەر جێگای خۆم ڕەق هەڵاتبووم، بێ
ئەوەی بتوانم بچووکترین جوڵانەوەیەک بکەم. بەڵام
جارێک بە چاوەکانی لەشی خۆم ئەوم بینی کە لە
پێشە من تێپەڕی و بزربوو. ئاخۆ ئەو گیان لەبەرێکی
ڕاستە قینە و یان بە بیرداهاتن و بۆریشکەو زیندە
خەونێک بوو؟ئاخۆ خەونم بینیبوو، یان لە بێداری و
هوشیاری بوو؟ هەر چەند کردم و کراندم و حوڵوو
دەولم دا کە وەبیرم بێتەوە لە خۆڕایی بوو. لەرزینەکی
تایبەتیم لە سەر تیرەو قەبەزەی پشتم هەست
پێکرد. لە دونیای خەیاڵاوی وام بە بەرچاویدا هات، کە
لەم کاتژمێرە هەموو نیسێ و سێبەرەکان سەرچیا و
کێوەکان گیانیان هاتبوو بەرو و ئەو کیژۆڵە یەکێک لە
دانیشتوانی پێشووی شاری قەدیمی و کەونارای
شاری ڕەی بووە. تەماشاگەیەک کە لە بەر چاوی من
بوو، یەک دەفحە بۆم ناسیاگ وئاشنا هات. لە
منداڵی ڕۆژێکی سێزدە بەدەرم هاتەوە بیر کە
هاتبوینە ئێرە، خەسووم و ئەو لکاتەش هاتبوون. لەو
ڕۆژیدا ئێمە چەندە لە پشت ئەو دارانەی شەنگەبی
بە دوای یەکدا هەڵدەهاتین و گەمەمان کرد! دوایی
گرووپێک لە منالانی دیکەش بەئیمە لکان کە بە باشیم
وەبیرنایێتەوە.

گەمەی"ســـــرمامک"مـــــان دەكـــــرد. جارێـــــک کە ئەمـــــن بە دوای لکـــاتە هەلیـــنگم دا لە نزیکـــایی ئەو چەمـــی ســـورن بـــــوو، لاقـــــی وی خۆشـــــــی لە چەم کەوت،ئەویـــــان دەرهێنـــاوە بردیـــان لە پشـــت دارەکـــانی شـــەنگەبی جلـــوو بەرگـــی بگـــۆڕن، ئەمـــــن بە دوای کەوتـــم. لە پێشـــــە وی پەردەیـــــان کێشـــــا بـــــوو، بەڵام ئەمـــــن بە دزی لە پشـــــت دارەکە هەمـــــوو لەشـــــی ویـــــم بینـــــی. ئەو پێـــــدەکەنی و قـــــامکی گەورەی دەســـــتی چەپەی دەجـــــووت. پاشـــــان، قەدیفەکیـــان تێپێچـــا و جلـــوو بەرگـــی ڕەشـــی ئاوریشـــمی ئەویـــان کە لە تـــانوو پـــۆی ناســـک چنـــرا بـــوو لە بەر خـــۆر هەڵخست.

لە ئاکامـــــدا لە بـــــن داری کەونـــــارای شـــــەنگەبی لە ســـــەر خیـــزڵان درێـــژ بـــووم. دەنگـــی ئـــاو وەکـــوو ئاخـــافتنی بـــڕ بـــڕەی تێنەگەیشـــــتراو مانـــــا دەرنەکەوتـــوو کە لە دونیـــــای خەو ســـــۆزەو نـــــارە نـــــاری دەکـــــرد، بە گـــــوێچکەم گەیـــــی. دەســـــتەکانم بێـــئەوی بمـــــهەوێ لە ڕەڵـــــم و خیـــــزی گەرم و نمـــــدار نـــــووغرۆ بـــــوون و چاڵـــــداکەفتن کـــــرد. چەو زیـــــخ و ڕەڵـــــم لیمـــــی نمـــــدارو بە هـــــاڵاوم لە مســـــتم دادەکوشـــــی، وەکـــوو گۆشـــتی لەشـــی کێژێـــک بـــوو کە لە ئـــاو کەوتبـــێ و جلەکانی ئاڵەگۆڕ کرد بن.

نـــازانم چەنـــد کـــاتی تێپەڕکـــرد چاخێـــک کە لە جێـــی خـــۆم هەســـــتام بـــێ ئەوەی بمـــــهەوێ وەڕێ کەوتـــم. هەمـــــوو جێـــیەک کـــپ و بێـــدەنگ و ئـــارام بـــوو. ئەمـــــن دەڕۆیشـــــتم بەڵام دەورو بەری خـــــــــــۆم نەدەدی. تابشـــــــــــتێک لە ئیختیـــاری مـــــن دانەبـــوو ئەمنـــی وادار بە ڕۆیشـــتن دەکـــرد. هەمـــــوو فکـــــرو زکـــــرو زەیـــــن و هۆشـــــم ئاگـــــاداری هەنگاوەکـــــانی خـــــۆم بـــــوو. ئەمـــــن ڕێگـــــا نەدەڕۆیشـــــتم، بەڵام وەک کێـــــــژی ڕەشـــــــپۆش لە ســـــــەرلاقەکانم

دەخوشـــــيم و ڕەت دەبـــــووم. کاتێـــــک کە وەخـــــۆ هـــــاتمەوە بينـــــيم ئەوە لە شـــــار لە بەر دەرگـــــای خەزورم، خـــــۆم بينـــــی. نـــــازانم بـــــۆچ رێـــــم لە مـــــاڵی خەزوورم کەوت! کـــــوڕە گچـــــکەکەی- بـــــرای خێـــــزانم- لە ســـــەر ســـــەکۆ دايشـــــتبوو،وەکوو ســـــێويک کە لە گەڵ خوشـــــکی لەت کـــــرابن. چـــــاوی دە شـــــيرين خێلـــــی تورکمەنی،کوڵمەکـــــانی دەرپەڕيـــــو، ڕەنگـــــی گەنـــــدومی،کەپۆی شـــــاوەتی، ڕوخســـــاری کـــــزو تێـــــک ســـــپماوی هەبـــــوو. هەر بەمجـــــۆرە دانيشـــــتبوو قـــــامکی شـــــادەی دەســـــتی چەپەی لە ســـــەر دەم دانابوو.

ئەمـــــن بـــــیٚ ئيختيـــــار چـــــوومە پـــــێش،ئەو کوليچـــــانەی کە لە گيرفـــــانم دابـــــوون دەرهێنـــــاو بە ويـــــم دان و گـــــوتم: " ئەمـــــانە شـــــاجوون بـــــۆی نـــــاردوی" چـــــونکە بە خێزانـــــی منـــــی- کە خۆشـــــکی بـــــوو- دەگـــــوت شـــــا جـــــوون. ئەو بەو چـــــاوانەی تـــــورکمەنی خـــــۆی  چـــــاوێکی واق وڕمـــــاوی لە مـــــن کـــــرد،کە کوليچەکـــــانی بە شـــــک و گومـــــانەوە وەدەســـــتی گرتبـــــوو. ئەمـــــن لە ســـــەر ســـــەکۆی مـــــاڵ دانيشـــــتم ئەوم لە ئـــــامێز کـــــرد بە خـــــۆمەوەم کوشـــــی. لەشـــــی گەرم و لاقەکـــــانی وەکـــــوو قاچەکـــــانی خێـــــزانم بـــــوو، هەر ئەو جـــــولانەوەی بێتەکليفـــــی وی هەبـــــوو. لێوەکـــــانی وی، وەکـــــوو لێوەکـــــانی بـــــاوکی بـــــوو،بەڵام ئەوهەی لە لای بـــــاوکی ئەمنـــــی بێرێـــــز دەکـــــرد بە پـــــێچەوانە لە ويـــــدا بـــــۆ مـــــن جەزمەو ڕاکێشـــــەری هەبـــــوو، وەکـــــوو ئەمە بـــــوو کە لێوەکـــــانی نيـــــوە کـــــراوەی وی تـــــازە لە مـــــاچێکی گەرم و دوروو درێـــــژ جيـــــا بـــــۆتەوە، دەمـــــی نيـــــوە کـــــراوەی ويـــــم ڕامووســـــی کە وەکـــــوو لێوەکـــــانی خێـــــزانم بـــــوو. ليوەکـــــانی وی تـــــام و چەژی کـــــۆنە هارويـــــان دەدا- تـــــاڵ وگـــــس بـــــوو. ڕەنـــــگە لێوەکـــــانی ئەو لکـــــاتەيەش ئەم تام وچێژەی هەبێت!

لەم وەخـــتە دابینـــیم بـــاوکی- ئەو پیرەمێـــرە پشـــت کـــوڕە کە شـــاڵگەردنی بەســـتبوو- لە مـــاڵ هـــاتە دەروو بـــێ ئەوەی چـــاو لە مـــن بکـــات تێـــپەڕی. دابـــڕ پێـــدەکەنی، کەنینێکـــی ترســـەنۆک و مەترســـیدار بـــوو، کە مـــووی لە لەش مـــرۆڤ دەکـــردە نیشـــتەر،و شـــانەکانی لە تونـــدی پێکەنـــین وەلەرزیـــن کەوتبـــوون. لە بەر خەجـــاڵەتی وەخـــت بـــوو بـــبمە دڵـــۆپە ئاوێـــک و بە هەرد دابچـــمە خـــوارو زەوی قـــووتم دا. نێزیکـــانی ڕۆژ ئـــاوا بـــوو، ڕابـــووم، وەک وەی دەمەویســـت لە بەر خـــۆم و لە دەســـت خـــۆم ڕاکەم و هەڵـــیم. وام بە نەزەر گەیـــی کە لە نـــاو شـــارێکی بیـــانی و پێنەزانـــراو نەناســـراو دەگەڕێـــم! ڕێـــزە مـــاڵێکی دەســـەیرو ســـەمەرە بە شـــکڵی هەندەســـی بـــڕ بـــڕ بە لابـــاجەی بەجێهێڵـــراو بە جێهیشـــتراوی ڕەش و بـــرش لە دەوروپشـــتی مـــن بـــوو. وەکـــوو ئەوە بـــوو کە هـــیچ کـــات بوونەوەرێـــک نەیـــدەتوانی لە وێ ســـەقامگیر و دانیشـــتوو بێـــت. بەڵام دیوارەکـــانی ســـپی وی بە ڕووناکـــایەتی کەمتـــا کـــورت دەدروشـــاوە، شـــتێکی عەجایـــب و غەریـــب بوو،شـــتێک کە نەمـــدەتوانی بـــاوەڕ بـــکەم،لە بەرابەر هەر کـــام لەو دیـــوارانە ڕادەوەســـتام، ســـێبەرم لە بەر شـــەبەقی مانگەشـــەوی خەســـت و مـــایەدار، وەدیـــوار دەکەوت بەڵام بێســـەر بـــوو. ســـێبەرەکەم ســـەری نەبـــوو. بیســـتبووم کە ئەگەر نیســـێی کەســـێک ســـەری نەبیـــت، هەتاسەری ساڵ دەمرێت.

بە تـــرس و لەرزەو واردی مـــاڵەکەم بـــووم و پەنـــام بـــۆ هـــۆدەکەم بـــرد. لەو وەخـــتەدا لـــووتم داڕســـا، لە دوایـــی وەی کە خـــوێنێکی زۆر لە کەپـــۆم هـــات بە بێهوشـــی لە جیـــی و بانـــدا کەوتـــم. دایـــانەکەم خەرێکـــی پەرســـاری مـــن بوو.

بەر لە وەی بخەوم لە ئاوێنە چاوم لە چرۆچاوی خۆم کرد، بینیم ڕوخسارم تیکشکا بوو، بنەبڕو بێگیان ببوو. بە ڕادەیەک ئاسەوار بڕاو ئەجکاندراو تێکچوو بوو، کە خۆم نەدەناسیەوە. چوومە ناو تەخت و خواب لێفەم بە سەر خۆمدادا، خۆم گەوزاند، ڕووم لە لای دیوار کرد، لاقەکانم کێشانەوە باڵخۆم و خڕ کردنەوە، چاوەکانم لە سەر یەک دانان و هەودای خەیاڵم وەدەست گرت. ئەو هەودایانەی کە چارە نووسی تاریک، خەماوی، بە هەیبەت و پڕ لە کەیفی منی پێکدەهێنا، ئەو شوێنەی کە ژیان لە گەڵ مەرگ و مردن پێکەوە تێکەڵ دەبن و ئەکس و وێنەو شکڵەکانی بیر چەوت و تەلاساو ڕێ وەن کردو لێگۆڕاو لادەر وەدیدیت، ئارەزوو مەیلەکانی کوژراوی دێرین، جاریکی تر زیندوو دەبنەوە هاواری تۆڵە دەکەن. لەم چاخە دا لە سروشت و دونیای ڕەواڵەت هەڵدەکەندرام وحازر دەبووم کە لە جەرەیانی ئەزەلی بنەبڕو نابوود بم. چەند جار لە گەڵ خۆمم جەزمە کرد:" مەرگ.. مەرگ..." مردن... مردن..."لە کویی؟" ئەمە ئۆخەژنی دا بە من و چاوکانم کەوتنە سەریەک.

کە چاوەکانم بەسترا، بینیم کە لە ناو محەمەدیە بووم، دارێکی بەرزیان چەقاند بوو، پێرە مێرەکی کەلالەیان لە پێش هۆدەکەم بە سێدارە هەڵاوەسیبوو. چەند کەس تەنگە کەری مەست لە بن دار شەڕابیان دەنۆشی. خەسووم بە ڕوخسارێکی داگیرساو،بە چەحرەیەک کە لە کاتی پۆنگژاوی خیزانم، ئێستا دەبینم کە ڕەنگی لێوەکانی دەپەڕێ و چاوەکانی گچکەو ترسەنۆک دەبوون، دەستی منی دەکێشا و لە ناو خەڵک تێدەپەڕی و بە میرغەزەب،کە

جلی سووری لە بەر دابوو نیشان دەدام و دەیگوت: "ئەوەش لە دار بدەن" ئەمن بە ترس و لەرزەوە لە خەو ڕادەپەڕیم، وەکوو کووره دەسوتام و ئاورینگم دەدان، لەشم لە ئارەقەدا تەڕو شتڵ ببوو ڕوومەتم ئاگریان لێدەباری. بۆ ئەوەی خۆم لە دەست ئەم کامووسەی ڕزگار بکەم هەستام ئاوم خوارد کەمێکم لە چڕوچاوی خۆم دا. دیسان راکشام، بەڵام خەوم نەدەهات.

لە بەر نیسێی ڕووناکی هۆدە لە گۆزەی ئاو کە لە سەر ڕەفحە بوو دەمڕوانی. وام بە نەزەر دا هات هەتا ئەو کاتەی کە گۆزە لە سەر ڕەفحەیە ناتوانم بنووم. ترسێکی بێجێم بۆ ساز ببوو، کە گۆزە دەکەوێ،ڕابووم کە جیی گۆزەکەی پارێزگاری بکەم، بەڵام بە هۆی دنەی نەزانراو کە بۆخۆم ئاگاداری نەبووم، دەستم بە ئەنقەست وە گۆزە کەوت،گۆزە کەوتە خوارو شکا. لە ئاکامدا پێلوەکانی چاوم پشاوتن،بەڵام وام هاتە نەزەر کە دایانەم هەستاوە چاو لە من دەکات.

مستەکانی خۆم لە بن لیفە کردە گرێ،بەڵام چ ڕووداوێک ڕووی نەداو نەقەوما. لە حاڵی بێهۆشی دەنگی دەرکەی کوچەم بیست، دەنگی پێی دایانم، وە بن گوێچکە کەوت کە دەمپاکانی لە هەرد دەخشاند و چوو نان و پەنیری هێنا. پاشان دەنگێکی دووردەستی فروختارێک هات، کە گاسی دەکرد"سفرەبەرە شاتوت..."

نا، ژیانێکی باوو ئاسایی،خاووفش و ماندوەتی دەستی پێکرد بوو. ڕوناکایی زێدەتر دەبوو،کە چاوەکانم هەڵێنان لەتێک لە وەدیاری کەوتنی خۆر لە

سەر ڕووبەری ئاوی استێلک کە لە دەربیجەی هۆدەکەم وەمیچی کەوتبوو دەلەرزی. وام هاتە بەر چاو کە خەوی دوێ شەو ئەوەندە دوورو ئاسوار بڕاو ڕیشەکێش کراو بوو، وەک ئەوەی چەند ساڵ پێش کاتێک کە منداڵ بووم بینیومە. دایانم چێشتی منی هێناوە، وەکوو ئەمە بوو کە ڕوخساری دایانم لە سەر ئاوێنەیەک دابێتەوە، ئەوندە دریژە پێدراو ئاڵدووزو کزو وەبەر چاوە کەوت،بە شکڵێکی باوەڕ نەکراو وسەیرو سەمەرە گۆڕانکاری بەسەردا هاتبوو، وەک وەی کە قورسایی دەم و چاوی کێشرابێتە خوار.

هەر چەند نەنکی خۆشەویستم دەیزانی دووکەڵی قەننەی ئاوی، بۆ من زەرەری هەیە، بەڵام دیسان لە هۆدەکەم قەلوونی دەکێشا. لە بنەڕەتەوە هەتا قەننەی نەدەکێشا بە دەماخ نەدەبوو. ئەو هێندە دایانەکەم لە ماڵەکەی لە بووک و کوڕەکەی قسەی بۆ کرد بووم، ئەمنیشی لەگەڵ کەیفەکانی شاوەتی خۆی هاو بەش و شەریک کردبوو. چەندە شێتانەیە! جارو بارە لە خۆوە دەکەوتمە فکری ژیانی کەسینی ماڵی دایانەکەم،بەڵام نازانم بۆ ژیان و خۆشی خەڵکی دیکە، دڵی من وەژان دێنیت- لە حاڵێکدا دەمزانی ژیواری من تەواو بووە و بە شیوەیەکی خەماوی و لە سەرەخۆ دەکوژێتەوە! بە من چ پەیوەندی هەبوو کە فکرم هاو دەمی ژیانی ئەو شێتانە و ئالۆجەلۆیانە بکەم کە ساخ و سەلیم بوون،باشیان دەخوارد، باش دەنووستن، و کاری سەرجێیان دەکرد و هیچ کات زەڕرەیەک دەردوو ناسۆری منیان هەست پێنەکرد بوو، باڵەکانی مردن چ چرکە، لە سەرو سیمایان نەخشا بوو؟

نەنەگیانم وەکوو منداڵەکان لە گەڵ من ڕەفتاری دەکرد. دەیەویست لە هەموو شوێنێک ئەمن بدینی. ئەمن هێشتا لە خێزانم شەرمەگێلاخەم دەکرد. کە لاقم لە هۆدەکەم دەن،ئەمن ئەو خڵتەی کە لە"لەگەنم" کرد بوو دامدەپۆشی. شەبقەم ڕیکووپێک دەکرد. بەڵام لە کن دایانەکەم چ شیوە شەرمەگێلاخەم نەبوو. چونکە ئەم ژنە کە هیچ پەیوەندی لە گەل من نەبوو، خۆی ئەوەندە تێکەڵ بە ژیانی من کرد بوو. وەبیرم دێ لەم هۆدەیە، لە سەر ئاوی حەنبار،کورسییان دادەنا. ئەمن و دایانەکەم لە گەڵ ئەم لکاتەیە لە دەورەی کورسی دەنووستین. تاریک و ڕوونی بەیانی چاوەکانم هەڵدەهێنا، شکڵی سەر پەردەی گوڵدۆزی کە لە پێش دەرگا هەڵاوەسرا بوو لە بەرامبەر چاوەکانم گیانی دەگرت، چ پەردەیەکی سەیرو عەجایبات بوو؟ لە سەر پەردەکە وێنەی پێرە مێرێکی پشی کوور، وەک جوکیانی هند، مەندیل بەستوو لە بن دارێکی شەنگەبی دانیشتبوو، سازێکی وەکوو سێتاری لێوەڤان و سەماکەر لە دەست دابوو کێژێکی خوشکۆک وەکوو بوگام داسی کایکەردۆخی بۆتخانەی هند دەستەکانی لە زنجیر کێشرابوو، وەکوو ئەمە بوو کە ناچارە لە پێش پێرەمێرەکە،سەمابکات!

لە بەرە خۆمەوە فکرم دەکرد ڕەنگە ئەم پیرە مێرەشیان لە گەڵ مارێک لە کێبەرکێ لە چاڵاو هاویشتبێت، کە بەو شکڵە گۆڕاوەو مووی سەر و ڕوخساری سپی بووە. لەم پەردانەی زێڕ دۆزی هندی بوو، ڕەنگە باوکم یان مامم لە وڵاتانی دوورکەوتوویان نارد بوو.

وەختێک زۆر لەو شکڵە خورد دەبوومەوە، دەترسام.
دایانم بە خەواڵوو لە خەو قیت دەکردەوە،ئەو بەو
هەناسەی بۆنی ناخۆش و مووی ڕەق و زوورو ڕەشی
لە روخسارم دەخشا ئەمنی بە خۆوە دەکوشی.

سبحەینە کە چاوم هەڵدێنا دیسان ئەو هەر بەو
شکڵە وەبەر چاوم دەهات. تەنیا جەغزەکانی چڕو
چاوی قوڵترو بە پزوو گرژاوی تر وەکوریشک هاتبوو.
زوربەی بۆ لە بیرچوونەوە، بۆ راکردن و هەڵاتن لە
بەرخۆم، سەردەمی مناڵی خۆم وەبیر دێنمەوە. بۆ
وەی خۆم بەر لە بێماری هەست پێبکەم، هەست
بکەم کە ساخ و سەلامەتم، هێچتا هەستم دەکرد کە
مناڵم و بۆ مردنم،بۆ لە ناو چوونم، هەناسەیەکی
دووەمی بوو کە روحم و بەزەیی بە مندا دەهات، بە
حاڵی مناڵێکی کە دەمرێت. لەو وەختانەی پڕ
مەترسی ژیانی خۆم کاتێک روخساری ئارامی
دایانەکەم دەبینی، ڕەنگ پەڕیوە، چاوکانی نوغرۆ،
بێدەنگ و خەمگین و عێجز و پەرەکانی تەنکی لووت و
نیوچاوان ئێسکەکانی پانی ویم کە دەبیی،
بیرەڤانەکانی ئەو کاتان لە من دا زیندوو دەبوونەوە.
ڕەنگە شەپۆلەکانی تەژی لە ڕەمزو ڕازو نهێنی لە وی
دەدەڵاند، کە هۆکاری ئۆقرەگرتنی من دەبوو. خاڵێکی
گۆشتی  کە لە سەر لاجانگی بوو،  مووی لە سەر
ڕوابوو. وەک وەی کە تەنیا ئەمرۆ ئاگاداری خاڵی وی
بم. پێشتر کە چاوم لە روخساری دەکرد ئەوها لێی
ورد نەدەبوومەوە و ئەوها بە وردی لێم نەدەڕوانی.
بەڵام ئەگەر تەنکی خۆشەویستم بە ڕەواڵەت
گۆڕانکاری بە سەردا هاتبوو، هزرو فکری وەکوو خۆی
سەر بە مۆر ما بوو. تەنیا بە ژیانێکی زۆر تر

حەزوئیڵاقەی دەردەبڕی و لە مردن دەترسا. ئەو مێش و مەگەسانەی کە سەرەتای پاییز بۆ هۆدە هجووم و پەنایان دەهێنا. بەڵام ژیانی من، هەر ڕۆژو هەر چرکە دەگۆراو جۆر بە جۆر دەبوو. وای بۆ دەچووم کە درێژایی زەمان و گۆڕانکاریەک کە مومکین بوو ئینسانەکان لە ماوەی چەندین ساڵ تێیانداسەقامگیر بێ، بۆ من ئەو پەلەو تاوو تیژی و خولوو سووڕی مەسەلە، هەزاران جار دوو بەرابەروو توندتر ببوو. لە حاڵێکدا کە خۆشی وی بە شێوەیەکی ئاواژوو پێچەوانە بۆ لای سفر دەڕۆیی و ڕەنگە لە سفریش تیپەڕی دەکرد. کەسانێک هەن کە لە بیست وپێنج ساڵیدا دەست بە ڕەنج وکوێرەوەری و عەزاب کێشان دەکەن، لە حاڵێکدا کە زوربە لە خەڵک تەنیا لە کاتی مردنیان، زۆر سەبرو لە سەرەخۆ وەکوو چوڵەچرا کە ڕۆنەکەی تەواو دەبێت، دەکوژێنەوە.

نیوڕۆ کە دایانم فراوینی هێنا، ئەمن کاسکی ئاشم وەسەر خۆم گێڕا، هاوارم کرد، بە هەموو تینم هاوارم کرد. هەموو دانیشتوانی ماڵ هاتن لە بەر دەرگای ماڵم کۆ بوونەوە. ئەو لکاتەش هات و زوو ڕەت بوو. چاوم لە زگی کرد، مناڵی وەزگی کەتبوو، ئاوس بوو. نا،هێچتا نەزا بوو، چوون حەکیم باشیان خەبەر کرد. ئەمن لە پاڵخۆمدا کەیفم دەکرد کە هەر نەبێت ئەو گەوج و ئەحمەق و شێتانەم لە زەحمەت خستوون.

حەکیم باشی بە ڕدێنێکی سێ بستی، دەستووری دا کە ئەمن تریاک بکێشم. چ دەرمانێکی بە قیمەت بۆ ژیانی پڕ لە کولوو دەردو ناسووری من بوو!

جاخێـــــــک که تریـــــــاکم دەکێشــــــــا فکــــــــرم گەورە و زەریف،چـــالاک دەبـــوو. لە ئاقـــارو مەڵبەنـــدێکی ســـەرەوەی دونیـــایی بـــاوو ئاســـایی، خۆلـــوو ســـوریدەداو گشـــت و گـــوزاری دەکـــرد، بیـــرو بۆچـــوون و خەیـــاڵات و هزرەکـــانم لە تەڵەکەو داوو بەنـــدی گـــران و قورســـی شـــتەکانی ســـەر گـــۆی زەوی ئـــازاد دەبـــوو، بـــۆ لای ئاســـمانی ئـــارام و بێـــدەنگی دونیـــای کـــپ و بە تـــاڵ هەڵـــدەفڕی و دەڕۆیـــی، وەکـــوو ئەوەی ئەمنـــی لە ســـەر باڵەکـــانی شەمشـــمە کـــوێرەی زێڕاویـــی دانـــا بـــوو، لە دونیـــایەکی خـــاڵی و بەتـــاڵ و چـــۆڵ و هـــۆل و بە ورشـــەو و درەوشـــانەوە کە بە چ لەمپەرێـــک گەپچـــان ناکـــات، ســـەیرانم دەکـــرد. بە ڕادەیەک ئەم کـــارتێکەریە قووڵـــوو پـــڕ لە خۆشـــی و شایی و کەیف بوو هەتا لە مەرگیش خۆشی پتر بوو.

لە قەراخ مەنـــــقەڵ کە هەســــتامەوە چـــــوومە لای دەربـــیجەی ڕوو بە حەوشـــەکەمان، بینـــیم دایـــانم لە بەر خـــۆر دانیشـــتبووە، ســـەوزی خـــاوێن دەکـــردەوە. بیســـتم بە بـــووکەکەی گـــوت: ' هەمووومـــان دڵ زەعیـــف بـــووین، خۆزیـــا خـــۆدا کوشـــتبوای ئاســـودەی بکـــات". وەک دەڵـــێن حەکـــیم باشـــی بە وانـــی گوتبـــوو کە ئەمـــن چـــاک نـــابمەوە. بەڵام ئەمـــن پـــێم ســـەیر نەبـــوو. ئەو خەڵـــکە چەنـــدە بـــێ ئاقـــل و ئـــاوزەو ئەحمەقـــن! ســـاعاتێک دوایـــی بـــۆ مـــن چێشـــتێکی گەرمـــی هێنـــا، چاوەکـــانی بە هـــۆی گریـــان ســـوورو هەڵمســـابوو. بەڵام لە لای مـــن بە تـــۆبزی دەمـــی بەبـــزە دەکـــرد. لە پێشـــە مـــن گەمەی دەکـــرد، ئەویـــش چەنـــدە ناشـــیانە! بە خەیـــاڵی وان ئەمـــن نەمـــدەزانی! بەڵام بـــۆچی ئەو ژنـــکە ئەو هێنـــدە ســـەبارەت بە مـــن خۆشدەویســـتی دەردەبـــڕی؟ لە بەر چ هـــۆیەک خـــۆی بە شـــەریکی دەردی مـــن دەزانـــێ؟

ڕۆژێک پارەیان دابوویە، ئەو مەمکەکانی پیرەلۆک و ڕەشی وەکوو گۆزەڵەی لە زاری من ئاخنیبوو. خۆزیا خۆرە وەمەمکەکانی کەوتبوایە! ئێستا کە مەمکەکانی دەبینم ئاوەز لەدەست دەدەم بێزم هەڵدەستێ، ئەوکات چەندە بە مگێزو ئیشتیایەکی هەرە زۆر شیری ژیانی ویم دەمژی وگەرمای لەشمان تێکەل هەو دەبوو.

ئەو هەموو لەشی منی بە دەسماڵ پاک وخاوێن دەکردەوە ودەستڕیەوە ، بۆ ئەمە بوو کە ئێستاش بە جورئەت و بێباکی و چاو قایمی دەمسووری ڕوو هەڵماڵاوی و بیسامی بیگەڤی و زەهلەداری و زاتداری و جەسارەتی تایبەتی، کە مومکینە ژنێکی بێ مێرد هەیبێت، سەبارەت بە من ڕەفتار دەکات. هەر بەو چاوی منداڵی چاوی لە من دەکرد، چونکە سەر دەمێک ئەمنی ڕادەداشت. کێ دەزانی شاید لە گەڵ من پانپانۆکی کرد بێت، وەکوو دەستە خۆشک کە ژنان بۆ خۆیان هەڵدەبژێرن. ئێستاش بە چ پرسیارو تۆژەرەوەو وەرد بینی دەی تەپاندەوەو، ژێرو روو سەر نخوون و بە قەولی خۆی تەڕوو ویشک دەکرد. ئەگەر خێزانم،ئەو لکاتە بە من راگەیبوایە، ئەمن هیچ کات نەنەجونم، بۆ لای خۆم رێگە نەدەدا. چونکە لە پاڵ خۆمدا فکرم دەکرد کە بازنەو دایرەی هزرو هەست و ئیحساسی جوانی خێزانم زێدەتر لە ئی دایانم بوو، و یان تەنیا شاوەت ئەو هەست و شەرم و حەیای بۆ من وەدیهێنابوو. لەم بارەوە لە کن دایانەم کەمترم ڕوو دەربایستی هەبوو و تەنیا ئەو بوو کە بە من ڕادەگەیشت.

ڕەنـــــگە دایەنــــــم ئاقیـــــــدەی وا بـــــــووە کە قەزاو قەدەر ئەمجـــــۆرە بووە،هەســـــارەکەی ئەمە بــــووە. جــــگە لەمە ئەو لە بێمـــــاری منـــــی کەلکـــــی نــــاحەزو نــــابەجێ وەردەگـــــرت، هەمـــوو دەردی دڵـــی بنەمـــاڵەکەی، گشــــت و گـــــــــوزار، دەمەتەقەو مـــــــــرچ و مـــــــــۆڕی و بە بەریەک هەڵاچـــوون و پەرەچەنـــگ و چڕەچـــــڕ، دەمە قـــاڵە و قــــونە شــــــەڕ و گیـــــانی بەدفەڕو حەرامزادەیـــــی و گـــــدا نشـــــینی خـــۆی، بـــۆ مـــن ئـــازەنتی دەکـــردو لە داشـــگیرو بێژینـــگ دەداو شـــــی دەکـــــردەوە ودڵ پــــڕی خــــۆی لە بــــووکی هەبــــــوو، وەک ئەوە کە هەویــــــی ئەوە، و لە ئیشـــــــق و ئەوینـــــداری کـــــوڕەکەی ســـــەبارەت بە وی دزیبـــــوو، بە چ غەرز لێـــــی دەگێـــــڕاوەو نەقـــڵ دەکــــردا! دەبـــی بـــــووک خوشــــکۆک بێـــــت! ئەمـــــن لە دربـــــیچەی ڕوو بە حەســــــار ئەوم بینیبوو،چـــــاوی دەمەڕی،مـــــووی بـــــۆرو، کەپـــــۆی قەڵەمی بوو.

دایـــانم جـــارو بـــار لە مـــوجزاتی ئەنبیـــاو ئەولیـــا قســـەی بـــۆ دەکـــردم، بە بۆچـــوون وخەیـــاڵی خـــۆی، دەیەویســـت ئەمـــن بەوە دڵ ئـــۆقرە پێبـــدات. بەڵام ئەمـــــن بە فکـــری پـــیس و ڕەزاڵەت و ســـــووک و پەســــتی و بـــێ ئـــاوەزی و نەفـــامی و تێنەگیشــــتوویوو حەمـــاقەت ویـــم حەســـڕەت دەبـــرد. جـــار وابـــوو کـــاری ســـیخوڕی و شـــۆڤاری بـــۆ دەکـــردم، بـــۆ نمـــوونە چەنـــد ڕۆژ پـــێش  بە منـــی گـــوت:  کە کێـــژەکەی- یـــانی لکـــاتە-  کراســــی قیـــامەتی بـــۆ منـــاڵەکی خـــۆی دروە. دوای وەکـــوو وەی بـــوو ئەویـــش دەیزانـــی  و دڵـــی منـــی دەداوە. جـــارو بـــار دەچـــێ لە دەروجێرانـــان دەواو دەرمـــان دینـــێ، لای تەلەســـم و چـــارە نـــۆرو حەســـاوگەری، خـــاوەن جـــام دەڕوات. کتێـــب دەکـــاتەوە، ســـەبارەت بە مـــن لە گەڵ ئەوان راوێـــژ دەکـــات. چـــوار شـــەمۆ ئـــاخری ســـاڵ چـــوو

بـــوو لای شـەمۆڵە،کاســــکێکی هێنـــابوو کە پیـــوازو بـــرنج و ڕۆنــــی بۆبـــای تیــــدا بـــوو. گـــوتی ئەمەی بە نییەتـــی ســـەلامەتی مــــن ســــواڵ کــــرد بــــوو. هەمــــوو ئەو گەندوکەسافەتانەی بە دزی دەرخواردی من دەدا.

بەیــــن، بەیــــن، هەمـــوو کوڵاوەکـــانی حەکـــیم باشــــی لە نـــاوکی مــــن دەبەســـت- ئەو دەرمانـــــانەی کە بە پیـــری بـــۆمن بە ڕەوا زانــــین و شـــیاو دانـــابوو: ســــماق،ڕب ســــوس، کـــافور، پەڕی سیاوشــــان،گوڵی ســـپی بـــابونە، ڕۆنــــی قـــاز، تـــۆی کتــــان،تۆی ســــنەوبەر،خاکە شـــیرو نشاستە هەزار جۆر مەزەخڕەفاتی دیکە...

چەنــــد ڕۆژ پـــێش کتێبێکـــــی دوعـــــای بـــۆ هێنــــابووم کە بەســــتێک تــــۆزی لە ســــەر کەوتبــــوو. نەک تەنیــــا کتێبــــی دوعـــا بەڵکــــوو هــــیچ جـــۆرە کتێـــب و نوشــــتەو هزروفکـــری کشــــتەکی ئەلۆجەلۆکـــان بە کـــاری مــــن نـــایە. چ پێویســــت بە درۆو دۆدی بــــۆدی وان بــــوو؟ ئـــــاخۆ ئەمـــــن بۆخــــۆم ئاکـــــامی زنجیـــــرەیەک بــــنەچەکەو، تـــــۆرەمە، ڕەســــەن، ڕەچەڵەک، ڕەگەز، قەرەچــــــــــۆل، نــــــــــــژاد، وەچەی نەســــــلەکانی ڕابــــردوو نەبــــووم، و ئەزمــــوونی ئیرســــــی ئەوان لە مــــن دا نەمـــــا بــــۆوە؟ ئــــاخۆ ڕابــــردوو لە خــــودی منـــــدا نەبـــوو؟ بەڵام هــــیچ کــــات بە نقێـــژگە و نە دەنگــــی بانگــــدان و دەســــت نــــوێژ گــــرتن و تــــف فڕیـــــدان و دوو قەت بــــــوونەوەو لە بەرابەر خــــــودایەکی بە قـــــودڕەت و خـــــاوەن دەســــەڵات و توانـــا و ســــەر بەســــت کە دەبــــی بە زوانــــی عـــاڕەبی دەردی دڵـــی خـــۆتی بـــۆ بپشـــکنیەوەو بـــۆی ڕاڤەو ئـــازەنتی و شـــی بـــکەیەوە، دەنـــا گویـــا حـــاڵی نابێـــت، لە مـــن کـــار تـــێکەری نەبـــووە. ئەگەر چـــی پێشـــوو کە لەش ســـاخ بـــووم چەنـــد جـــار بە تـــۆبزی بـــۆ نقیـــژگە چـــوومەو نقیـــــژم کـــــردوە و تێکۆشــــــاوم کە دڵـــــی خــــۆم لە گەڵ

خەڵکی دیکە جوورو هاو ئاهەنگ بکەم. بەڵام چاوەکانم لە ڕووی ئەو کاشیانەی پڕ لە نەخش و نیگاری دیواری مزگەوت، کە ئەمنی بۆ لای خۆی ڕەکێش دەکردو دەبرد بێئەوەی بمهەوێ لەم وەسیلە، ڕێگەی هەڵاتن و دەرباز بوون بۆخۆم پەیدا دەکرد، زەق ڕوانی. لە کاتی دوعاکردن و پاڕانەوە چاوەکانی خۆم لە سەر یەک دادەنان لەپی دەستم لە بەر روخسارم دەگرت. لەم شەوەی کە بۆ خۆم وەدیهێنا بوو، وەکوو ئەو وشانەی کە بێ بەرپرسایەتی فکری لە خەو دا دووپات و چەند پات دەبنەوە، ئەمن دوعام دەکرد. بەڵام دەربڕینی ئەو وشانە لە قوڵای دڵ نبوو. چونکە ئەمن زۆرتر حەز دەکەم کە لە گەڵ دۆست و یان ئاشنایەک قسەبکەم هەتا لە گەڵ خودا-چونکە خوا لە من سەروترو زێدەتر بوو. ئەوکاتەی کە لە ناو جێوو بانی گەرم و نمدار نوستبووم هەمووو ئەو بابەتانەم بە ڕادەی  دەنکە جۆیەک بایەخ بۆ دانەدەنا،یان بڵێم بۆ منیان بە ئەندازەی دەنگە جۆیەک نرخ و قیمەت و ئیحتوبارو قەدرو ئەرزش نەبوو، و لەو چاخ دا نەمدەویست بزانم کە لە ڕاستیدا خودایەک بیەی هەیە یا کوو تەنیا شوێنی سەر هەڵدانی فەرمانڕەوا وحوکمڕانان سەر گۆی هەردە کە بۆ قایمبوونی پلەو پایەی باری تەعالاو بە تالانبردن و پوڕکردن حەق ڕامالین ورووتکردنەوە ماڵ ڵیساندنی موسکینەکان و ڕایەتەکان و هەژارەو دەستەوەستان و ژیر دەستانی خۆیان بە خەیاڵیانداهاتووە، فەڕزیانکردوە، ویانەو ڕوو پەڕی ڕۆی هەردیان بە ئاسمان ڕەنگداوەتەوە! تەنیا دەمەویست بزانم کە شەو بە سبەی دەگەینم، یان نا؟ هەستم کرد لە بەرامبەر مردن،مەزەب و ئاقیدە چەندە سست و

منداڵانەو نێزیکەی جۆرە گشت وگوزار بۆ ئەو کەسانەی لەش ساخ و خۆش بەخت و شانس بوو! لە بەرامبەردا بەراستی مەترسی و ترسنۆکی مردن و شیوەی گیان عذاب دەر و جانکاە کە رێدەپڕی ئەوەی پەیوەندار بە سزاو حەقدەست و گیان و رۆژی هاتوو هاوار لە زاریان کوشیبووم و لە مێشکیان چەسپاند بووم فریوەکی بی تام و چێژو بببوو،ئەو دوعایانەی کە فیریان کرد بووم لە بەرابەر مەترسی مەرگ و مردن چ کارتێکەری نەبوو.

نەک ترس لە مردن برۆکی منی بەرنەدەدا. کەسانێک کە ڕەنج و کوێرەوەری و دەردو کولیان نەکێشاوە ئەو زاراوانە نافامن و لێی حاڵینابن و تێی ناگەن. بە ڕادەیەک جوانی ژیان لە من دا زێدە ببوو کە بچۆکترین چرکەی خۆشی تۆڵەی گەلێک کاتژمێری دڵەکوتەو پەریشانی و بێتاقەتی و بێقەراری دەکردوە. دەمدیت کە کول و خەم و دەردو کوێرەوەری و کۆلەواری نەبوونی و هەژاری هەتڵەو هەڵوەدایی ئاراگیلی دەرپەڕاندن وبرسیایەتی وبی ماف بوون هەیە، بەڵام بەتاڵ وعەتاڵ لە هەر جۆرە چەمک و زانراو مەبەست و مانا بوو. ئەمن لە ناو ئالۆجەلۆکانی ڕەچەڵەک و نژادێکی نەزانراو نەناسراو، نەناس ببووم، بە جۆرێک کە لە بیرم کرد بوو کە پێشوو، بەشیک لە دونیای وان بووم. شتێک کە مەترسیداروترسێنەرو تۆقێنەرو وحشتناک بوو، هەستم پێدە کرد نە زیندووم و نەمردوو،تەنیامردوەکی جولاوە بووم، کە نە پەیوەندم لە گەڵ دونیای زیندوان هەبوو و نە لە فەراموشی و ئاسایشی مردن کەلکم وەردەگرت.

هەولی شەو لە ڕەخ مەنقەڵی تریاک ڕابووم، لە دەربیجەی هۆدەکەم چاوێکم لە دەرەوە کرد، دارێکی ویشکی ڕەش کە لە دووکانی قساوی کرا بوو ، وەبەر چاو کەوت. سێبەرەکانی بوڵێل تیکبەزیبوون. هەستم پێکرد کە هەموو شت بەتاڵ و ئامانەتییە. ئاسمانی ڕەشی قێراوی وەکوو ڕەشماڵێکی کۆن و دڕیاو بوو کە بە هۆی هەسارەکان لە ئەژمار بەدەر ورشەدارو کون کون ببوو. لەو وەختەدا دەنگی بانگدان بەرز بۆوە، بانگێکی بێ وەخت بوو،گۆیا ژنێک- ڕەنگە ئەو لکاتە- مناڵی دەبوو، قروسکەی سەگێک لە گەڵ بانگەکە دەبیسترا. ئەمن لە پاڵخۆمدا فکرم کرد:" ئەگەر ئەو قسە ڕاستە و هەر کەس هەساری خۆی هەیە، هەسارەی من دەبێ دوورو بوڵێڵ و بێ مانا و مفهوم بێت! لەوانەیە ئەمن هەر لە بنیات ئەستێرەم نەبووبێت!".

لەو چاخەدا دەنگی دەستەیەک پاسەوانی مەست لە ناو کوچە بەرز بۆوە، کە تێدەپەڕین پێکەوە گەمەو قسەی قۆرو بێتامیان دەکرد. دوایی هەموو پێکەوە ئەو بالۆرەیان دەست پێکرد:

" وەرە بڕۆین با مەی بخۆین،شەڕابی مولکی ڕەی بخۆین، ئیستا نەخۆین کەنگێ بخۆین"؟

ئەمن بە وەڕەزی و جاڕزی خۆم کێشاوە دوایی، دەنگی وان لە هەوا بە شیوەکی تایبەت ئاوازەی دەداوە، وردە وردە دەنگەکەیان دوور بۆوە خەفەوکپ بوو. نا، ئەوان کاریان بە مەن نەبوو، ئەوان هەر نەیاندەزانی و ئاگایان لە خۆشیان نەبوو....

جارەکی دیکە کپ و بیدەنگی و تاریکی باڵی بە سەر هەموولایەک داکێشا. ئەمن چۆڵەچرای هۆدەکەم هەڵکرد، حەزم دەکرد کە لە تاریکان دابنیشم. تاریکان، ئەو مادەیەی خەست و ڕەوان کە لە هەموو شوێن و هەموو شت دەلاندنی هەیە، ئەمن بە ویم عادەت گرتبوو، ئالوودەی ببووم. لە تاریکان دابوو کە فکرەکانم ون بوون، مەترسی لە بیرچوو،هزری بەسام و هەیبەت و باوەڕ نەکراو کە نەمدەزانی لە کام قولینچکی مێشک خۆی وەشاردبۆەو حاشاردرا بوو، هەموو شت لە سەرەتاوە گیانی دەگرت، بەڵام لاسای منی دەکردوە، دەمە لاسکەی دەکرد. قولینچکی هۆدە، پشتی پەردە، لە ڕەخ دەرگا،تەژی و دارماڵ لەو هزرو فکرانە و هەیکەلی بێشکڵ و هەڕەشەکەر بوو. لە وی لە قەراخ پەردە، هەیکەلێکی ترسەنۆک دانیشتبوو، نەدەبزووت، نە خەمناک بوو نە خۆشحاڵ و بە کەیف، هەر کات کە دەگەڕامەوە لە گلێنەی چاومی دەڕوانی. بە ڕوخساری وی ناسیاگ بووم، وەکوو ئەمە بوو کە لە منداڵی ئەو قەڵافەت و بەژن و باڵایەم بینیوە. ڕۆژێکی سێزدە بەدەر بوو،لە ڕەخ چەمی سورن، ئەمن لە گەڵ منداڵەکان گەمەی "سرمامک"م دەکرد، ئەو پەچک و بیچم و پۆتەراک و تەرح و چروچاوو دیدارم هاتبۆوە بەرچاو، کە بە قیافەو دەمووچاوی دیکە کە بەژن و باڵای کورت و مەسخەرەو بێ مەترسیان هەبوو خۆی نواند بوو، ڕەنگوو ڕەواڵێک وەک ئەو مرۆڤە قەساوە کە ڕوو بە ڕووی دەربیجەی هۆدەم دەچوو. وەک دەگێڕنەوە ئەو کابرایە لە ژیانی من تداخولی هەبووە و ئەوم زۆر بینی بوو! گۆیا ئەو سێبەری جمگی من بوو، لە بازنەی سنووورداری ژیانی من هەڵکەوتبوو...

کاتێـــک هەســـــتام چـــۆڵەچرا هەڵـــکەم ئەو هەیـــکەلە خـــود بە خـــود لە بەرچـــاوم رۆیـــی و بـــزرو ون بـــوو. چـــۆمە بەر ئـــاوێنە کە لە خـــۆم ڕامـــام، ئەو وێـــنەیەی کە لە ئـــاوێنەی نەخـــش بەســـت بیـــانی بـــوو. بـــاوەڕ نەکـــردوو مەترســـیدار بـــوو. وێـــنەی مـــن بە تابشـــت تـــرو لەخـــۆم خـــۆی دەنوانـــد، ئەمـــن وەک ئەکســـی ســـەر ئـــاوێنە بـــووم. وام بە فکـــردا هـــات نـــاتوانم تەنیـــا لە گەل خـــۆم لە هۆدەیەکـــدا بمێـــنمەوەو بـــژیم. دەترســـام ئەگەر هەڵـــێم و بـــۆی ڕاکـــم و بـــۆی دەربچـــم ئەو وەدوام بـــکەوێ، وەکـــوو ئەوە کە دوو پشـــیلە بـــۆ پەرەچەنـــگ ڕوو بەڕوو دەبـــن. بەڵام دەســـتم بەرز کـــرد، بەرچـــاوم گـــرت هەتـــا لە چـــاڵەی لەپـــی دەســـتم شـــەوێک ئەبەدی بخـــوڵقێنم. زوربە حـــالاتی تـــرس بـــۆم کەیـــف و مەســـتی تـــایبەتی هەبـــوو بە جۆرێـــک کە ســـەرم گێـــژ دەبوو،چۆکەکـــانم سســـت و شـــل دەبـــوو، دەمەویســـت بڕشـــێمەوە. لە ناکـــاو ئاگـــادار بـــووم کە لە ســـەرلاقەکانم ڕاوەســـتاوم. ئەم مەســـەلە بـــۆم ســـەیر بـــوو، مـــوجیزە بـــوو. چلـــۆن ئەمـــن دەمتـــوانی لە ســـەر لاقەکـــانم ڕاوەســـتم؟ وام بە زەینـــدا هـــات ئەگەر یەکێـــک لە قاچەکـــانی خـــۆم دەبـــزاوت هاوکێشـــی خـــۆم لە دەســـت دەداو جـــڵەوم لە دەســـت دەر دەچوو،جـــۆرە حـــالاتێکی ســـەرەگێژە بـــۆم پەیـــدا ببـــوو. زەویـــی و بـــوونەوەرانی بە ڕادەیەکـــی زۆر لە مـــن دوور ببـــوون. بە جـــۆرێکی نـــاڕوون و نادیـــار ئـــارەزووی بـــوومە لەرزە، یـــان هەســـارە ڕاخوشـــانێکی ئاســـمانیم دەکـــرد، بـــۆ ئەوی بتـــوانم ســـەر لە نـــوێ لە دونیـــای ئاســـوودەو ئـــارام و ڕووناك بێمە سەر گۆی زەوی.

کاتێـــک ویســـتم بچـــمە نـــاو نـــوێن، چەنـــد کەڕەت بە خـــۆم وت: "مـــردن... مـــردن..." .لیوەکـــانم پـــێکەوە وەنووســـا

بوو، بەڵام لە دەنگی خۆم دەترسام. لە بنیات بوێری و بە جەرگی و ئازایەتی و بێگەڤی پێشوو لە من دا نەما بوو. وەکوو مێشم لێهاتبوو کە سەرەتای پاییز بۆ هودە هێرش دینن، مێشەکانی ویشکبوو بێگیان لە دەنگی وزەی باڵی خۆیان خۆف دەکەن ودەترسن ودەڕەونەوە.  چرکەیەک بێدەنگ و بزوتنەوە مێگەلێک لە سەر دیوار کروشمە دەبەستن و خۆمات دەدەن،کاتێک کە تێگدەگەن کە زیندون خۆیان بێ ترس و واهیمە و هەراس،بە دەروو دیوار دادەکەن و تەرمی وان لە کەلێن و قوژبی هۆدە دەکەوێت.

پێلوەکانی چاوم کە دەهاتە خوار دونیایەک بێ ئاسەواری لە پێشم نەخشی دەبەست،دونیایەک کە هەمووم بۆخۆم وەدیهێنابوو ولە گەڵ فکروهزرو بینینەکانم هاو تەرازو بەرامبەر دەهاتەوە،لە حاڵێکدا زۆر ڕاست ترو سروشتی تر لە دونیای وەخەبەر بوون و هوشیاریم بوو،وەکوو ئەمە چ لەمپەرو پێشگر لە پێش فکرو بیروچوونم بیەی نەبوو، زەمان و مەکان کار تێکەری خۆیان لە دەست دەدا. ئەم هەستی شاوەتی کوژراو کە خەوی وەدیهێنانی وی بوو بێچووهێنانی ئاتاجی دوایینی ئیمە بوو،ئاڕووشەکانوو ڕووداوەکان باوەڕ نەکراو، بەڵام سروشتی لە بەر چاوی من شکڵ پیدەداو دەخستەبەر چاو، پاش ئەوەی کە وەخەبەر هاتم لەو  چرکەدا هێچتا بە بوونی خۆم شک و گومان هەبوو،لە زەمان و مەکانی خۆم بێخەبەر بووم، گویا ئەو خەوانە کە دەمدیتن هەمووم بۆخۆم دورست کرد بوو شڕوڤەو لێکدانەوەی ڕاستی ئەوم دەزانی.

بەتلێک لە شەو تێپەڕیبوو کە خەوم وێکەوت. لە ناکاو بینیم لە کوچەکانی شارێکی نامۆ کە ماڵەکانی سەیرو سەمەرەو بە ئەشکاڵی هەندەسی،قویچ و چوار قولینچک، بە دەریچەی کورت و تاریک دورست کرا بوو و لە دەرو دیواری ئەوان گوڵی نەیلوفەڕ هالا بوو، بە ئازادی و سەر بەستی دەگەڕام و بە هاسانی هەناسەم هەڵدەکێشا. بەڵام دانیشتوانی ئەو شارە بە نەخۆشیەکی غەوارو بێگانەیەک مرد بوون. هەموو لە جێی خۆیان ڕەق هەڵاتبوون، دوو تنووکە خوێن لە زاریان هەتا سەر جلووبەرگیان هاتبوو خوار. دەستم لە هەر کامەکیان دەدا سەری هەڵدەقەندرا و دەکەوت.

گەیمە بەر دووکانێکی قساوی، مرۆڤێک وەکوو پیرە مێرێکی کەلالە، لە بەر ماڵەکەمان بە شاڵگەردنێکی بەستراو، کاردێکی دەستەداری لە دەست دابوو و بەو دووچاوی سووری وەکوو ئەوە کە پێلوەکانیان بڕیبێ لە منی دەڕوانی. ویستم چەقوکەی لە دەست دەرێنم، سەری هەڵقەندراو بە هەردا کەوت. ئەمن لە عەجەمەت وترسان دەستم بە هەڵاتن کرد. لە کوچەکان هەڵدەهاتم، هەر کەسێکم دەبینی لە سەر جێگای خۆی ڕەق هەڵاتبوو. دەترسام ئاوڕ وەپشت سەرم دەمەوە. کە خۆم گەیاندە بەر دەرگای خەزوورم، برای خێزانم - برای گچکەی ئەو،لکاتە- لە سەر سەکۆ دانیشتبوو، دەستم لە گیرفانم ڕۆکرد کە دووکولیچەی بۆ دەرێنم، ویستم وەدەستی بدەم بەڵام وەختێک دەستم وێکەوت، سەری هەڵقەندرا وکەوتە خوار. ئەمن هاوارم کرد و لە خەو وەخەبەر هاتم.

هەوا هێچتـــــا تارێـــــک و ڕوون بـــــوو،دڵم لێیـــــدەدا، وام بە
نەزەر هـــات کە مـــیچ لە بـــانی ســـەرم قورســـایی دەکـــرد،
دیوارەکـــــان لە ڕادەو ئەنـــــدازە بەدەر ئەســـــتوور و بەجەم
ببـــوون، ســـینگم دەیەویســـت بقەڵشـــێت. ســـۆمایی چـــاوم
بێرەنـــگ ببـــوو. ســـەر دەمێـــک بە حـــاڵاتێکی ترســـەنۆک
چـــاوم لە کـــوڵەکە و کـــاریتەو ئاڵەدارەکـــانی هـــۆدە بڕیبـــوو،
ئەوانـــم دەژمـــاردن، و دوو بـــارە و جـــارێکی دیـــکە و دیســـان
لە ســـەر را دەســـتم پیـــدەکردەوە. چاخێـــک چـــاوم
هەڵپشـــاوتن دەنگێـــک هـــات. نەنکەگیـــانم هـــاتبوو، هەتـــا
هـــۆدەکەم گەســـک بـــدات، چێشـــتانەی منـــی لە وەتـــاخی
باڵەخـــانە دانـــا بـــوو، ئەمـــن چـــوومە باڵەخـــانە دانیشـــتم.
لەو ســـەرەوە پیـــرە مێرێکـــی کەلەلا، لە بەر هـــۆدەکەم
ســـەروکەللەی دیـــار نەبـــوو، تەنیـــا لە لای چەپەوە پیـــاوە
قەســـاوەکەم بینـــی،بەڵام ڕەفتـــارو کـــرداری وی کە لە
دریـــچەی هـــۆدەکەم بە شـــێوەیەکی ترســـەنۆک،
قورس،هەڵســـەنگاو وەبەر چـــاو دەکەوت، لە ســـەرەوە
بە هەژارو مەزلوومـــانە دەبینـــدرا، وەکـــوو ئەوەی کە ئەو
مـــرۆڤە نەدەبـــوایە کـــاری قەســـاوی بێـــت و گەمەی
کـــردوە. پاشـــتەرکی ئەو ئەســـبە ڕەشـــوو کـــز و بێهێـــزانەی
لە دوو لا دوو کەلەشـــی پەزیـــان پێهەلاوەســـرا بـــوو،
کـــۆخەی دەویشـــک و قوڵیـــان دەکـــرد. کـــابرای قەســـاو
دەســـتی چەوری بە ســـمێڵی داهێنا،چـــاوەکی
کڕیـــارانەی لە مەڕەکـــان کـــرد دوو ســـەری لەوان بە
زەحـــمەت بـــرد بە چەنگەکـــی دووکـــانی هەڵاوەســـین.
ســـەری مەڕەکـــانی دەلاوانـــدنەوە. ڕەنـــگە دوێ شـــەو کە
دەســـتی لە لەشـــی خیزانـــی خشـــاند بێـــت، بیـــری
مەڕەکـــان کردبـــێ و فکـــری کـــربێتەوە، ئەگەر ژنەکـــی
کوشتبوایە، چەندەی پارە وەردەگرت!

که گەسک لێدان تەواو بوو، بۆ هۆدەکەم گەڕامەوە، بڕیارێکم گرت- بڕیارێکی ترسێنەرو تۆقێنەر : چوومە خڵوەتی هۆدەم، چەقوی دەسک ئێسکم لە سندوقۆڵە دەرهێنا، تیغەکەم بە داوینی عەبام خاوێن کردەوە و لە بن سەرینم دانا. ئەو بڕیارم لەمێژ بوو گرتبوو. بەڵام نەمدەزانی چ لە بزوتنەوەی مرۆڤی قەساودا بوو کاتێک کە ڕانی مەڕەکانی پشک پشک و لەت لەت دەبڕی، لە تەرازوی دەداو وەزن دەکرد، دوایی سیلە چاوێکی بە ئافەرمی دەکرد کە ئەمن لە خۆرا هەستم کرد کە دەمەویست لاسای وی بکەمەوە. بە پێویستم زانی کە ئەم کەیفە بکەم. لە دربیجەی هۆدەکەم لە ناو هەورەکان کونێکی بە تەواوی عابی قووڵ، لە سەر ئاسمان وەبەر چاو کەوت. وام بەزەیندا هات بۆ ئەوی بتوانم بگەمە وێ، دەبێ لە نەردیوانێکی بەرز وەسەر کەوم. قەراخ قوجاخی ئاسمان هەوری زەردی خەست و خۆڵ، ئەوێی ئالوودە کرد بوو،بە جۆرێک کە لە سەر هەموو شار قورسایی دەکرد. هەوایەکی بەسام و تەژی لە کەیف بوو. نازانم بۆ چ ئەمن بۆ هەرد دادەهاتمەوە! دایم و دەرهەم لەم شیوە هەوایە ئەمن وەفکری مردن دەکەوتم. بەڵام ئێستا کە مردن بە ڕوخساری خوێناوی و پەنجە ئێسکەکانی، گەرووی ڕێکدەکوشیم، ئێستا تەنیا بڕیارم گرتبوو کە ئەم لکاتەش لە گەل خۆم بەرم هەتا دوایی من، نەڵێن"خودا لێخۆشبوو ئاسوودە بوو!."

لەم چاخە دا لە بەر دەربیجەی هۆدەکەم تابووتەکیان دەبرد، کە پارچەکی ڕەشیان بە سەردا هەڵکێشابوو، لە سەرەوەی تابووت شەمیان ئایساند بوون.

دەنگی"لاالەالاالله" ئەمنی ئاگادار کرد. هەموو کاسبکارو ڕێبوار لە رێگەی خۆیان دەگەڕانەوە و حەوت هەنگاو بە دوای تابووت دا دەڕۆیشتن. هەتا کابرای قەساویش هات و بۆ خێر، حەوت شەقاو بە دوای تابووت دا ڕۆیی و بۆ دووکان گەڕاوە. بەڵام پیرە مێری دەستفرۆش کەلوو پەلەکانی لە سەر سفرە کۆ نەکردەوە. هەموو خەڵک رەنگ و ڕوخساری مجدیان بە خۆوە گرتبوو! ڕەنگە وەبیری فەلسەفەی مردنی ئەو دونیا کەوتبوون! دایانەکەم کە بۆ منی غەزای گەرم هێنا، بینیم نێوچاون گرژبوو.،دەنکە تەسبێحی گەورەی داویشت و لە گەل خۆی زکر دەکرد. هات نوێژەکەی لە پشت هۆدەکەی من کرد و بە دەنگێکی بەرز دەیخوێند" الاهم،الاهم..."

وەک ئەوەی کە ئەمن کار بە دەستی لێبوردنی زیندوەکان بم!  بەڵام سەر جەمی ئەو بزدان و پاسقاڵی لە من دا چ کار تێکەری نەبوو. بە پێچەوانە کەیفم دەکرد کە ئالۆ جەلۆکانیش هەر چەند ئامانت و درۆ، بەڵام چەند چرکە دونیای منیان دەبڕی. ئاخۆ هۆدەی من تابووتێک نەبوو؟ جێووبانم ساردتر و تاریک ترو تەنگتر لە قەبر نەبوو؟ جێوو بانێک کە دایم و دەرهەم لە گوڕێ بوو، ئەمنی بانگهێشتن بۆ نووستن دەکرد. چەند کەڕەت ئەو فکرم هاتە بەر، کە لە تابووت دام. شەوانە بە تەرتیب و لێک و لە باری هۆدەکەم گچکە دەبوو، ئەمنی ڕێک دەکوشی. ئاخۆ لە قەبر ئەو ئیحساسە ناکەن؟ ئاخۆ کەس لە هەست و ئیحساساتی دوایی مەرگ خەبەرداره؟

هەر چەند خوێن لە لەشی من ڕادەوەستێ و پاش شەو ڕۆژێک بازێک لە ئەندامی من دەست بە لێک

بڵاوبوون دەکات، بەڵام هەتا سەردەمێک دوای مردن
مووی سەرو نێنووک شین دەبنەوە. ئاخۆ
هەستەکانی دەرونی و هەناو ئەژنەو ئەشنەویش
دوایی ڕاوەستانی دڵ لە ناو دەچن و یان هەتا
سەردەمێک لە پاشماوەی خوێنێک کە لە دەمارو
ڕەگەکانی گچکەدا هەن، لە ژیانێکی ناڕوون و نادیار
بەردەوام دەبن؟ هەست بە مەرگ بۆخۆی ترسەنۆکە،
چ بگات بە ئەمە کە هەست بکەن کە مردوون! پێری
ئەوها هەن کە زەردە خەنەیان لە سەر لێوو بە
پێکەنینەوە دەمرن، وەکوو ئەمە کە دەخەون، یان وەک
چۆڵەچرایەک کە دەکوژێتەوە. بەڵام لاوەکی بە گورد
کە لە ناکاو دەمرێ و هەموو ئەندامی لەشی هەتا
سەردەمێک دژی، لە گەڵ مەرگ دەجەنگی، چ
هەست و ئیحساسێکی دەبێت؟

گەلێک جار بە فکری مردن و لەت و پەت و ڕزیوو
بوونی لەشم کەوتبووم،بە شیوەیەک کە ئەم فکرە
ئەمنی نەدەترساند، بە پێچەوانە ئارەزوەی بەراستیم
دەکرد کە نیست و نابوود بم. لە تەنیا شتێک کە
دەترسام ئەمە بوو کە زەڕراتی لەشم بۆ ناو زەڕراتی
لەشی ئالۆوجەلۆیەکان بڕوات. ئەم فکرە لە بۆم لە
تابشت بە دوورو باشار نەکراو بوو. جار وابوو دڵم
دەیخواست هەتا هەموو زەڕراتی لەشی خۆم بە
وردی کۆ کرد بواوە و لە دەستم دا راگرتبوایە، هەتا
زەڕراتی لەشی من کە ماڵی منن، بۆ ناو لەشی
ئالۆو جەلوکان نەچن. جار فکرم دەکرد ئەوەی کە
دەمبینی، کەسانێک کە لە سەر گیانەڵڵاو ئاویلکەدان
و ئاوزینگ دانن، ئەوانیش دەیاندێ. ترس و لەرزو
دڵەهورەو مەیلی ژیان لە مندا دامرکا بوو،لە ئاخنینی

ئاقیدەیەک کە دەمێشکی منیان هاوشتبوو
ئارامبوونێکی تایبەتیم لە خودا هەست پێدەکرد. تەنیا
شتێک کە لە منی دڵخۆشدەرەوە ودڵنەوادەرەوە
دەکرد، هیوای نەبوون پاشی مەرگ بوو. فکری ژیانی
سەر لە نوێ ئەمنی دەترساند و ماندوودەکرد. ئەمن
هێچتا بەو دونیایەی کە دەویدا ژیانم تێپەڕ دەکرد
هاودەم نەببووم وخۆم پێنەگرتبوو، دونیای دیکە چی
بۆ من تێدا بوو؟ بێگومان بە دەردی منی نەدەخوارد؟
هەستم دەکرد کە ئەم دونیا بۆ من نەبوو، بۆ
دەستەیەک ئینسانەکانی بێحەیا، پڕ ڕوو،سواڵکەر،
زانیاری فرۆش،چوار داوڕوو، چاوو دڵ برسی، بۆ
کەسانێک کە لێهاتوویی ئەو دونیایە خولقاندرابوون،
لە دەسەڵاتدرانی زەوی و ئاسمان وەکوو سەگی
برسی لە بەر دەرکەی قەساوی کە پشکە پۆکێک
کلکە سووتە دەکات سواڵیان دەکرد. ئیکلامیان
دەکێشا و ماستاوچیەتی و زوان لووسی و خۆ
ڕێکخەری پێڕامووسی تەڕ زوانی و تەشی ڕێسیان
دەکرد. فکری ژیانی سەر لە نوێ ئەمنی دەترساندو
ماندوو دەکرد. نا،ئەمن ئاتاجیم بە بینینی ئەو هەموو
دوونیایانەی هەڵینجهێنەر و قیافانەی نکبەتبار نەبوو.
مەگین خودا ئەوندە نەدی بدی بوو، کە دونیای خۆی
بە چاوی ئێمە داداتەوە؟ بەڵام ئەمن تاریفی درۆ
ناتوانم بکەم و لە حاڵێکدا کە دەبی دونیای تازە
ببڕی، ئارەزوم ئەوە بوو کە فکرە هەست و
ئیحساسێکی بێهەست و پنج تەزاوو هەڵقەندراوم
هەبوایە، بە هاسانی پشووم هەڵدەکیشا، بێ ئەوە
هەست بە ماندوەتی بکەم،دەمتوانی لە سێبەری
کۆڵەکەکانی پەرسگەی" لینگم" بۆخۆم ژیانم
تێپەڕکەم. پیاسەم دەکرد بەجۆرێک کە خۆر لە چاوم

نەکەوتبوایە، قسەی خەڵک و دەنگی ژیان گوێچکەی کەڕ دەکردم.

هەر چەند زۆرتر دەچوومە باڵەخۆم،وەکوو ئەو گیانلەبەرانەی کە وەرزی زستانان خۆیان لە کونێک دەکەوتن و دەخزێنن، دەنگی ئی دیکەم بەگوێچکە دەبیست و دەنگی خۆم لە گەرومدا گوێ لێدەبوو. تەنیایی و لاتەریکی و دووورە پەرێزی خۆ لە خەڵکی دوور خستنەوەو دزینەوە، خۆی لە پشت سەرم حاشار دابوو، وەکوو شەوەکانی ئەزەلی مەیو و تێکشیلدراو تیکچڕژاو بوو، شەوەکانی تاریکی پێوەنووساویان هەیە و چاوەڕوانن لە سەر،سەری شارەکانی خلوەت کە تەژی لە خەونەکانی شاوەت بزوێنن،بڕووخێن. بەڵام ئەمن لە بەرابەر ئەو گەورەییە کە بۆ خۆم بووم، زیدە لە جۆرێک سەلماندنی بە بەڵگە و نیشاندان و سەقامگیر کردنی ئازادەو بەر خوەدارو بەردریاگ وشێت، شتێکی دیکە نەبووم. تەوژم و فشارێک کە لە کاتی بە دونیا هاتن وەکوو دووکەس بۆ چارەسەری تەنیایی پێکەوە دەنووسێن و لە ئاکامی ئەو لایانە دێوانەیە کە لە هەموو کەس دا بیەی هەیە و لە گەڵ داخ و حەسەرەت ئاویتە بووە، بە سەبرو لە سەرەخۆ بۆ لای قوڵای مەرگ خوازیار دەبێت.

تەنیا مردنە کە درۆ ناکات! بوون و حزووری مردن هەموو خەیاڵات نیست ونابوودو ڕیشەکێش دەکات. ئێمە منداڵی مردنیین و مردنە کە ئێمەی لە فریووخواردنی ژیان کردن ڕزگار دەکات و نەجات دەدات،و لە بنەبانی ژیان کە ئێمە گاس دەکات و بۆ لای خۆمان بانگهیشتن دەکات. لەو تەمەنانەی کە

ئـــێمه هێشـــتا زوانـــی خەڵـــک تێنـــاگەین، ئەگەر چەلێـــک لە نـــــاو گەمە ڕادەوەســـــتین، وچـــــان دەدین،بـــــۆ ئەمەیە کە دەنگــــــی مــــــردن ببیســــــین. و لە تەواوی ســــــەردەمی ژیـــــوار،مەرگە کە بە ئـــــیمە ئامـــــاژە دەکـــــات. ئـــــاخۆ بـــــۆ کەســـێک ڕووی نەداوە کە لە ناکـــاو بـــێ بەڵـــگە بە فکـــری دا بچێـــت و ئەوەنـــدە لە هـــزردا قـــوم ببێـــت کە لە زەمـــان و مەکـــانی خـــۆی بـــێخەبەر ببێـــت و نەزانـــی کە فکـــری چ شـــتێک دەکـــات؟ ئەو کـــات دوایـــی دەبـــێ تێبکۆشـــێ بـــۆ ئەوەی  بە چلۆنـــایەتی و هەڵکەوتـــی دونیـــای ڕەواڵەتـــی خـــۆی ســـەر لە نـــوێ ئاگـــاهو ئاشـــنا بێـــت. ئەمە دەنگـــی مەرگە.

لەم نوینـــــوو بـــــانەی تەڕوو نمـــــدار کە بـــــۆنی ئـــــارەقەی گرتبـــوو، وەختێـــک کە پێلـــووی چاوەکـــانم قورســـایی دەکـــرد دەمهەویســـــت خـــــۆم بە نیســـــت و نەبـــــوون و شـــــەوی ئەبەدی بەدەســـــتەوە بـــــدەم، هەمـــــوو بیرڤانەکـــانی بـــزرو ون بـــوو ترســـەکانی لە بیـــر چـــووم، ســـەر لە نـــوی گیانیـــان دەهـــاتەوە بەر- ترســـــی ئەمە کە تووکەکـــانی نـــاو بـــاڵنج، تیـــغ بـــڕ بڕیـــان بکـــات،دووگمەی "نـــیم تەنەم"  بە ڕادەی بەرداشـــیک گەورە بێـــت، ترســـــی ئەمە لەتە نانێـــک کە لە ســـەر هەرد دەکەوێ، وەکـــوو شووشـــە بشـــکێت و هەرد بقڵشـــــــــێنێت،دوو دڵـــــــــی ئەوەمە کە ئەگەر خەوم وێـــبکەوێ، نەوتـــی چـــۆلە چـــراکەم بـــڕژێتە ســـەر زەوی و شـــار ئـــاور بگـــرێ، نیگەرانـــی ئەوەمە کە لاقەکـــانی ســـەگی بەر دووکـــانی قەســـاو، وەکـــوو ســـمی ئەســـب دەنـــگ بـــداتەوە، دلهـــورەم ئەمەیە کە ئەم پیـــرە مێـــرەی کەلالە، لە رەخ ســـــفرەی خرتـــــووپرتەکەی پێکەنیننـــــی بێـــێ و نتوانێـــت پێشـــی پێکەنیـــنەکەی بگـــرێ- ترســـم لەمەیە کە کرمـــــی نـــــاو لاقشـــــۆری ئەســـــتیرکی

ماڵەکەمـــــان، ببێـــــتە مـــــاری هنـــــدی، ترســـــم لەمەیە جییوبـــــانەکەم ببێـــــتە بەردی قەبـــــر، و بە هـــــۆی لـــــولەیەک لە دەورەی خـــــۆی، ئەمـــــن وخـــــۆی وەبـــــن خـــــۆڵ بخـــــات و ددانەکـــــانی مەڕمەڕ پـــــێکەوە قفـــــڵ بکـــــرێن، ترســـــم ئەوەیە دەنگـــــم هەڵنەبـــــڕێ و هەر چەنـــــد هـــــاواربکەم کەس بە فەریام نەگات...

ئەمـــــن ئـــــارەزوم دەکـــــرد کە منـــــداڵەتی خـــــۆم وەبیـــــر بێـــــنمەوە، بەڵام چاخێـــــک کە دەهـــــات و ئەوم هەســـــت پێـــــدە کـــــرد وەکـــــوو ئەو ســـــەردەمی ئارووشـــــەو دەرد هێـــــنەر بـــــوو! کۆخەکـــــان، دەنگـــــی کـــــۆخەی ئەســـــبەکانی ڕەشـــــی کـــــزو لاواز، لە بەر دووکـــــانی قەســـــاوی دەهـــــات،بە تـــــۆبزی فڕیـــــدانی شـــــتی تـــــیکەڵاو، مەترســـــی ئەمە مەبـــــادا پەڵەو پنـــــۆکی خـــــوێن دەویـــــدا وەبەر چـــــاو بـــــکەوێ- خـــــوێنی ئەو مـــــادەیەی جەلال و ڕەوان،و شـــــۆرمەزە کە لە بنەبـــــانی لەش دێـــــتە دەر کە شـــــیرەی ژیـــــانە و ناچـــــار دەبـــــوایە بڕشـــــێتەوەو بیهێنیـــــتەوە، هەڕەشـــــەی دائیمـــــی مـــــردن کە هەمـــــوو فکـــــرو هـــــزری وی بـــــێ ئومیـــــد گەڕانـــــدوە، پێشـــــێل دەکات و تێدەپەڕێ، بی ترس واهیمە نەبوو.

ژیـــــانی پشـــــوو درێـــــژی و بە حەوســـــەلەیی، و بـــــایەج پێـــــنەدان و بەهێنـــــد نەگـــــرتن ڕوخســـــاری هەر کەس بـــــۆ خـــــۆی زاهیـــــر دەکـــــات، وەک دەڵـــــێن هەر کەســـــێک چەنـــــد ڕوخســـــاری هەیە! بازێـــــک تەنیـــــا لە یەکێـــــک لەو ڕوخســـــارانە بەردەوام کەلـــــک وەردەگـــــرێ کە سروشـــــتییە وەک کلمـــــیچ و کلمـــــیس دەبیـــــت، یـــــان قەوچەل و وپـــــزو گەنجـــــی تیـــــدەکەوێ و پیرەڵـــــۆک و چـــــرووک دەبـــــێ. ئەم دەســـــتەیە لە خەرج ئەنـــــدازە رادەگـــــرن. دەســـــتەکەی دیـــــکە ڕوخســـــاری خۆیـــــان، بـــــۆ ئەولادی خۆیـــــان رادەگـــــرن، بـــــازێکی دیـــــکە بەردەوام ڕووی خۆیـــــان دەگـــــۆڕن، بەڵام

کاتێــک لە نێــو کەوتــن و پیــر بــوون دەفــامن و تێــدەگەن کە ئەمە ئـــاخرین ڕوخســـاری ئەوان بـــووە، کە خیـــرا دەکـــار کـــراوەو کۆنبـــووگ بـــوەو و لە نـــاو دەچێـــت،ئەو کـــات ڕوخســـاری ڕاســـتەقینەی ئەوان لە پشـــت ڕووی ئـــاخری ئەوان خۆی نیشان دەدات.

نـــازانم دیوارەکـــانی هـــۆدەم چ کـــارتێکەریەکی ژەهرئـــاوی پێبـــوو، کە هزروفکـــری منـــان دەرمانـــداو مەســـموم کـــرد! ئەمـــن لـــێم یەقـــین بـــوو کە بەر لە مەرگ، کەســـێکی دیـــوانە و شـــێتی زنجیـــری لەم هـــۆدە بـــووە،نەک تەنیـــا دیوارەکـــانی هـــۆدەم بەڵکـــوو تەماشـــاگەی دەرەوە،ئەو کـــابرای قەســـاو،پیرەمێری کەلالە، ئەو لکـــاتە، و هەمـــوو ئەو کەســـانەی کە ئەمـــن بینـــیمن وهەر وا کاســـکێکی ئاشـــخۆری کە ئەمـــن دەویـــدا ئاشـــی جـــۆم دەخـــوارد، ئەو جـــل و بەرگەی کە لە بەرم بـــوو، هەمـــوو ئەوانە دەســـتی یەکتریـــان گرتبـــوو، بـــۆ ئەمە ئەو فکـــرە لە منـــدا وەدی بێنن.

چەنـــد شـــەو پێشـــتر کاتێـــک لە شانشـــینی حەمـــام جـــل و بەرگەم داکەنـــد فکـــرو هـــزرم گـــۆڕا. کـــابرای حەمـــامچی کە ئـــاوی بە ســـەرمدا دەکـــرد، وەکـــوو ئەمە بـــوو کە فکرەکـــانی ڕەشـــمی شووشـــتۆتەوە. لە حەمـــام ســـێبەری خـــۆم لە ســـەر دیوارەکـــانی تەڕی ئـــارەقە کـــردو بینـــی. بینـــیم ئەونـــدە لاوازو تێکشـــکاوم کە دەســـاڵ پـــێش چاخێـــک زارۆک بـــووم،بە باشـــیم لە بیـــر بـــوو ســـێبەری لەشـــم بەمجـــۆرە لە ســـەردیواری ئـــارق کـــردوی حەمـــام دەکەوت. لە لەشـــی خـــۆم ڕامـــام،ران،بەلەکی پـــێ، نـــاوقەدم حـــاڵاتێکی شـــاوەت بـــزوین وناهومیـــدی هەبـــوو. ســـێبەری ئەوان وەکـــوو دەســـاڵ پـــێش بـــوو- وەکـــوو وەختێـــک کە گچـــکە بـــووم. هەســـتم پێکـــرد کە ژیـــانی مـــن

ســـــەرجەم وەکـــــوو نیســــێ ســـــەر گەردان،ســـــێبەرەکانی لەرزۆکـــی ســـەر دیـــواری حەمـــام بـــێ مانـــاو بـــێ مەقســـەد تێپەڕیـــــوە، بەڵام ئـــــی خەڵکـــــی دیـــــکە قورس،مـــــوحکەم و مـــــل ئەســـــتوور بـــوون. ویـــــدەچێ ســـــێبەری ئەوان لە ســـــەر دیـــــواری ئـــــارق کـــــردوی حەمـــــام پڕرەنگتـــــر وگەورەتـــــر دەکەوت و هەتـــــا ســـــــەردەمێک شـــــــوێنەواری خـــــۆی دەهیشـــــــتەوە. لە حاڵێکـــــدا ســـــێبەری مـــــن زۆر زووپـــــاک دەبۆوە دەسترِاوە.

لە شـــــوێنی جلـــــوو بەرگ داکەنـــــدن، لیباســـــم پۆشـــــی، بـــــزوتنەوەم، قیـــــافەم، فکرەکـــــانم ســـــەر لە نـــــوێ گـــــۆڕا. وەکـــــوو ئەمە کە پـــێم لە مەڵبەنـــدو دونیـــایەکی تـــازە نـــاوە. وەکـــــوو ئەمە کە لەو دونیـــــای کە لێـــــی بێـــــزم هەڵدەســـــتا و بێـــزار بـــووم، جـــارێکی تـــر بـــۆ ســـەر ئەو دونیـــا هـــاتبووم. لە هەر حاڵـــــدا دوو بـــــارە ژیـــــانم وەدەســـــت هێنـــــابووە. چـــــونکە بـــــۆم مـــــوجزە بـــــوو کە لە خەزێـــــنەی حەمـــــام وەکـــــوو کڵـــــۆ خوێیەک نەتوابوومەوەو نەبیووم بە ئاو.

ژیـــــانی مـــــن بە بـــــۆ چـــــوونی خـــــۆم، ئەوەنـــــدە ناسروشـــــتی، نـــــامەعلووم و بـــــاوەڕ پێنەکـــــراو دەبینـــــدرا، کە شـــــکڵی ســـــەر قەڵەمـــــــدانێک کە خەریکـــــــی نوســـــــینی ویـــــــم، گۆیـــــــا کەســـــێکی نەخـــــش کێشـــــی دیـــــوانەو واسواســـــی ســـــەر جلـــــدی ئەو قەڵەمـــــدانەی کێشـــــاوە. زوربە چـــــاو لەو شـــــکڵە دەکەم وەکـــــــوو ئەمەیە کە بە بۆچـــــــوونی مـــــــن ئاشـــــــناگ دێـــــت. دارێکـــــی شـــــەنگەبێ کێشـــــراوە کە لە بنـــــی پیـــــرە مێرەکـــــــی پشـــــــت کـــــــوڕ وەکـــــــوو جوکیـــــــانی هندوســـــــتان هەڵتروشـــــــکاوە... عەبـــــای لە خـــــۆ پێچـــــاوە، مەنـــــدیلی لە ســـــەر بەســـــتووە، بە حـــــاڵاتی واق وڕمـــــان قـــــامکی شـــــادەی لە ســـــــەر دەمـــــــی دانـــــــاوە. لە ڕوو بەڕووی وی کێژێـــــــک بە جلـــــــــــووبەرگی ڕەش و درێـــــــــــژ و بە حـــــــــــاڵاتێکی

ناسروشـــــتی،ڕەنگە بوگــــام داســـــیەکە، لە پـــێش وی ســـەما دەکـــات،گوڵێکی نەیلـــوفەڕی وەدەســـت گرتـــووە و لە نێوان وان جوگەلەیەکی ئەو مابەینە.

لە بـــن بەزم و ڕەزمـــی مەنقەڵـــی تریـــاک، هەمـــوو فکـــرو هـــزری تـــاریکم لە نـــاو دووکەڵـــی زەریـــف و جـــوانی ئاســـمانی بـــڵاو کـــردەوە. لەم چـــاخەدا لەشـــم فکـــری دەکـــرد، جەســـــتەم خەوی دەدیـــــت، هەڵدەخولیســــکا وەکـــــوو ئەمە لە قورســـــی و هەوای ئـــــازاد کـــــراو، لە دونیـــای پێنەزانـــراو نەبینـــدراو کە پـــڕ و تەژی و دارمـــاڵ و لێپاولێـــپ و دار بەســـەر لە ڕەنـــگ و وێنەکـــانی نەبینـــراو بـــوو، بـــاڵی گرتبـــوو دەفـــڕێ. تریـــاک گیـــانی نەبـــاتی، گیـــانی بەزوتنەوەیەکـــی هێـــور لە کلیشـــەو جەســـتەو جەنـــدەکی مـــن پفیبـــوو. ئەمـــن لە دونیـــای گیـــایی چـــورتم لێـــدەداو بۆرشـــکم دەبـــرد، ببـــووم بە گیـــا،بەڵام هەر بەمجـــۆرە کە لە پـــێش مەنـــقەل و ســـفرەی چەرمـــی چـــۆرتم لێـــدەدا و عەبـــا لە ســـەر شـــانم بـــوو، نـــازانم بـــۆچ وەبیری پیرە مێری کەلالە کەوتم!

ئەو هەر وا لە پـــــێش دەم و دەزگـــــاکەی چەمیـــــاگی دەکـــرد و بەم حـــاڵە دادەنیشـــت. ئەو فکـــرە شـــوێنی مەترســـی بـــۆ ودەیهێنـــام، ڕابـــوومە ســـەر پـــێ و عەبـــام تـــوور هەڵداشـــت،چوومە بەر ئـــاوێنە، کوڵمەکـــانم وا ســـوور هەڵگڕابـــوون، دەتگـــوت دایســـێن، وەک ڕەنگـــی گۆشـــتی پـــێش دووکـــانی قســـاوی بـــوو، ڕدێنـــیم ناڕیکووپێـــک بەڵام حـــاڵات و شـــیوەیەکی ڕوحـــانی و ڕاکەش و کێشـــەرم پەیـــدا کـــرد بـــوو. چاوەکـــانی نەخۆشـــم حـــاڵاتی مانـــدووەتی، ئـــازار دیتـــوو و دڵ ئێشـــاو دڵڕەنجـــاوو تـــۆراو منـــداڵانەی هەبـــوو. وەک ئەوەی هەمـــوو شـــتەکانی قورســـی ژێـــر زەمینـــی و ئاکـــاری مرۆڤـــانەو

ئینسانییەت لە من دا ببوو بە ئاو. لە بینینی ڕوخساری خۆم کەیفم کرد،جۆرێک کەیفی شاوەتیم لە خۆم دەبینی. لە بەر ئاوێنە بەخۆم گوت: " دەردوکولی تۆ ئەوندە قووڵە کە لە بنەبانی چاو گیری کردوە،..." وئەگەر بگریەی یان فرمێسک لە پشت چاوت دێتەدەر، یان لە بنیات دا ئەسرینت لوزەو نابەستیّ!...پاشان دوو بارە بەخۆم دەگوت : " ئەتۆ دین و ئەحمەقی! بۆ خێراتر شەڕی خوت وەڵا نابەی؟ چاوەڕوانی چی؟ هێجتا تەوەقوع و چاوەڕوانیت هەیە؟ مەگین شووشەی شەڕاب لە خلوەتی هۆدە نییە؟ چۆڕێکی بنۆشە و قومێکی لێبخۆوە ڕۆیی کە ڕۆیی! ئەحمەق! ئەتۆ ئەحمەقی!"

ئەمن لە گەڵ هەوا دەئاخافتم! ئەو فکرانەی کە بۆم دەهاتنە ژوان، پێکەوە پەیوەندیان نەبوو. دەنگی خۆم لە قڕقڕۆچکم دەبیست، بەڵام مانای وشەکان تێنەدەگەیشتم. لە مێشکم دا ئەو دەنگانە لە گەڵ دەنگەکانی دیکە تێکەڵ دەبوون، بۆ نموونە کاتێک کە گەندەتام لێبوو، قامکەکانی پەنجەم گەورەتر وەبەر چاو دەکەوت،پێلوی چاوەکانم قورساتییان دەکرد، لێوەکانم ئەستوور ببوو. کاتێک گەڕامەوە بینیم دایانەکەم لە ناو چوار چیوەی دەرگا ڕاوەستاوە. ئەمن دامە قاقای پێکەنین. ڕوخساری دایانەکەم نەدەبزووت، چاوەکانی بێ سۆمایی لە من ڕادەما، بەڵام بێ واق وڕمان، یان تووڕە بوون و بێ تێکترینجاوو پلمەژیاگ بوو. لە سەر یەک بزووتنەوەی شێتانە پێکەنین دینیّ، بەڵام پێکەنینی من قووڵتر لە وی بوو. ئەم ئەحمەقەی گەورە بەو هەمووشتانەی دیکە کە لە دونیا لێی حاڵی نەبوونە تێگەینی ڕژدو

دژواره پەیوەندی هەبوو. ئەو هەی لە بنەبانی تاریکی شەوەکان ون بووە، بزوتنەوەیەکی بالا دەستی بەشەری مردن بوو. دایانەکەم مەنقەڵی هەڵگرت و بە هەنگاوی ئەژماردە چوو دەر، ئەمن ئارەقەی سەر نێوچاوانی خۆم ئەسترییەوە، لەپی دەستەکانم پنۆکی سپی تێکەوتبوو. پاڵم وەدیواردا، سەری خۆم وە سەر بناخەی دیوار کرد، وەکوو وەی کە حاڵم باشتر بوو،دوایی نازانم ئەو گۆڕانییەم لە کوێ بیستبوو! لە بن لێوانم دا نارەنارم پێکرد" وەرە هەتا کوو مەی بخۆین، شەڕابی مولکی ڕەی بخۆین، ئێستا نەخۆین کەنگێ بخۆین؟"

دایم و دەرهەم بەر لە نوێژی نیورۆ ئاخگەو قەیران لە دڵمدا کار تێکەری هەبوو. پەریشانی بێقەراوی و دڵپەشیویی و بێتاقەتی دڵ کرمێبوونێکی تایبەتی لە من دا بەدیدەهات، دڵە خورپەو حاڵاتێکی خەماوی بوو، وەکوو گرێیەک کە لە سەر دڵم خڕ ببێتەوە، وەکوو ئاو هەوایەکی بەر لە باهۆزو بلێک و بۆران و لەنگێزو تۆفان، ئەوکات دونیای راستەقینە لە من دوور دەبوو و لە دونیایەکی برووسکەدارو بە دەروشین و گرشەدارو شاهێک و شەوقدار و بریقەدار، ژیانم دەکرد کە بە درێژایی بەراوردو تەخمین نەکراو لە گەڵ دونیای سەر گۆی زەوی تەوفیرو مابەینی هەبوو. لەو کاتەدا لە خۆم دەترسام،لە هەمووکەس دەترسام، وەک دەڵێن ئەو حاڵاتە پەیوەندی بە نەخۆشی بوو. بۆ من ئەمە بوو کە فکرم بێ بنیەو وبێتین و تەشک زراڤ وبێهێزو کزو لاوازو خەستەو دەردمەن ببوو. لە بەر دەرکەی دریچەی هۆدەکەم پیرەمێرێکی پەککەوتە،و قەساویشم کە بینی ترسام. ئەزانم لە

بزووتنەوەو جولانەوە و قیافەی ئەوان چ شتێک ترسێنەر بوو! دایانەم شتێکی ترسەنۆکی بۆ گێڕامەوە، دیگوت: "سوێندی بە پیرو پێغەمبەر دەخوارد کە بینیویە کە ئەو پیاوە پیرە پەک کەوتەیە، شەوانە دێتە بەر دەرگای هۆدەی خێزانم، و لە پشت دەرگا بیستبووی کە لکاتە بەوی دەگوت"شاڵگەردەنت بکەوە!"

قەت ناتوانی فکری لێبکەی! دووێنێ یان پێرێ بوو وەختێک کە گاسم کرد و خیزانم هاتبوو،لە کونی درگای هۆدەکەم بینیم،بە چاوی خۆم بینیم کە شوێنی ددانەکانی چڵکن و زەردو کرماوی پیرەمێر کە لە کەلێنەکانیان ئایەتی عارەبی دەهاتە دەر، لە سەر لێوی خێزانم بوو. لە بنەڕەترا بۆچی ئەم مرۆڤە لەو کاتەی کە ئەمن ژنم هێناوە لە بەر دەرگای ماڵی من پەیدا بوو؟ ئاخۆ بێماڵ و حاڵ بوو؟ بێماڵوو حاڵی ئەم لکاتە ببوو؟ وەبیرم دێ ئەو ڕۆژێک چوومە سەر دەم و دەزگای پێرەمێر، بایی گۆزەم لێ پەرسیار کرد. لە ناو شاڵگەردن دوو ددانی کرماوی لە لای لێوی شەکەری هاتەدەر،پێکەنی، پێکەنێنەکی ناخۆش و تاڵ و بێزاو ویشک، کە موو لە لەشی مرۆڤ قیت دەبۆوە، و گوتی" ئاخۆ نەدیتوو دەیکڕی؟ ئەم گۆزەڵەیە قابیلی نییە ها. بیبە،خێری لێببینی".

ئەمن دەستم لە گیرفانم ڕۆ کرد، دوو دەرهەم و چوار پەشیزم لە سەر سفرەکە،دانا، دیسان پێکەنی، پێکەنینێکی پیس و ناحەزو بێز وەبوو، بە جۆرێک کە مووی لە لەشی مرۆڤ قیت دەکردەوە. ئەمن لە بەر خەجاڵەتی دەمەویست بم بە دڵۆپە ئاوێک و زەوی قووتم بدات. بە دەستەکانم پێشی ڕوخسارم گرت و

گەڕامەوە. لەو خرتوو پرتەی لە پێش وی، بۆنی ژەنگاوی کەلووپەلی کۆن، کە ژیانی وانی وەڵام دەداوە دەکرا. ڕەنگە دەیەویست شتەکانی کۆنی ژیانی بەئیمە نێشان بدات! بە خەڵک نیشان بدات! ئاخۆ بۆخۆی پیرو پەککەوتە نەبوو؟ شتەکانی سەر سفرەی وی هەموو بێ کەلک و لە کار کەوتوو بوو، بەڵام چ ژیانێکی پیس و پەڵۆس و ئاوە سوو، چاوو ڕوو قایم، چ ژێنێکی چارداوڕوانە، بیشەرم بێئابڕوو، بەڵام چ ژێان و چ شکڵەکانی پڕ مانای هەبوو! ئەو شتوومەکی بێ کەلک و بیگێان بە ڕادەیەک کار تێکەری خۆیان لە من دابەجێهێشت، کە ئینسانەکانی زیندوو نەیاندەتوانی لە من کارتێکەری دابنێن.

بەڵام نەنکی خۆشەویستم خەبەری بۆ هینابووم، بە هەموانی گوتبوو"لە گەڵ سوڵکەرێکی پیس وپۆخڵ!" دایانەکەم گوتی : جێووبانی خێزانم ئەسپێی تێکەوتبوو بۆخۆشی چۆتە حەمام.

سێبەری وی لە سەر دیواری ئارەقە کردووی حەمام چ جۆر بووە؟ ڕەنگە سێبەری شاوەتی کە بە خۆی هیوادار بووە! بەڵام لە سەر یەک ئەم کەڕەت سەلیقەی خێزانم پێ خەراپ نەبوو،چونکە پیاوە پیرە مرۆڤێکی ئاسایی و بێتام و بەد حەمەل، وەکوو ئەم مرۆڤانەی تۆقی کە ژەنەکانی حەکەدار و نەزان بۆ لای خۆیان ڕادەکێشن، نەبوو. ئەم دەردانە، ئەم چینانەی چارەڕەشی، کە بە مەزنایەتی و سەروەری پێرەمێر قاتماغ بەستبوو، و بەد بەختی کە لە دەورو بەری دەباری، لەوانەیە بۆخۆشی نەیزانێبێت، بەڵام ئەوی وەکوو نیمچە خودایەک نمایش دەداو بەو سفرە

پیســـــوو پەڵۆســـــەی، کە لە پـــــێش وی بــــوو، نـــــوێنەرو چاوگەی سەر هەڵدانی بەدیهێنان و خەلقەت بوو.

بەڵــــێ شـــــوێنی دوو ددان، ددانـــــی زەردی کـــــرم خـــــواردوو کە لە کەلێنیـــــان ئایەتەکـــــانی عـــــاڕەبی دەهـــــاتە دەر،لە ســــــەر ڕوخســــــاری خێــــــزانم بینیبــــــووم. ئەم ژنە کە نەیدەهێشــــــت ئەمـــــن تخـــــوونی بـــــم، و ئەمنـــــی دەشــــــکاندوەو ســــــوکایەتی پێـــــدەکردم، بەڵام بە بـــــوونی ئەو هەمـــــــــــووانە ئەوم خۆشدەویســــــــــت. بە تەواوی لەشــــم، بە تەواوی وجــــودم، هەر چەنــــد ئەو هەتــــا ئێســــتا ئیجــــــازەی پێنەدابــــــووم تەنـــــانەت بــــۆ جارێــــــک ڕووی ڕامووسم!

خــــۆر زەرد بــــوو،دەنگیکی بە ئــــێش و ژانـــــی نەقــــارە بەرز بــــۆوە، دەنگـــــــی پـــــاڕانەوەو لاڵانەوەیەک کە هەمـــــــوو خەڕافــــــاتی ئیرســـــــی و تــــــرس، لە تــــــاریکی وەخەبەر دەهێنــــا. حــــاڵاتی ئــــاخگەو قەیــــران، حاڵاتێــــک کە پێشــــتر کــــاری لە دڵــــم کــــرد بــــوو، چــــاوەڕوانی بــــووم بێــــت. گەرمـــــــایەکی ســــــووتێنەر سەرانســـــــەری لەشـــــــی داگرتبــــووم، دەهــــاتم بخنکــــێم، چــــووم لە نــــاو جێووبانـــدا بـــۆی ڕاکشـــــام و چاوەکـــــانم لە ســـــەر یەک دانــــــان. لە حەجمەتــــی گەنــــدەتا وەکــــوو ئەمە بــــوو کە هەمــــوو شــــتێک گەورە بــــووە، پەراوێــــز لە ســــەر پەراویــــز، لێــــوار لە ســــەر لێــــوار. مــــیچ لە جیــــاتی دابــــکەوێ، بەرز ببــــۆوە. جلــــوو بەرگەکــــانم لەشــــمیان فشــــاردەدا. لە خــــۆرا ڕابــــووم لە نــــاو نــــوێن و بــــان دانیشــــتم. لە پاڵخۆمــــدا نارەنــــارم دەکــــرد: " لەمە زێــــدەتر مــــومکین نیــــیە..." باشــــار نەکــــراوو لە تــــاقەت بەدوورە... لە ناکــــاو کــــپ و بێــــدەنگ بــــووم. پاشــــان بە حــــاڵاتی ئەژمــــاردن بە دەنگــــی بەرز و بە شــــیوەیەکی گەمە پیــــدان دەمگــــوت:" لەمە زێــــدەتر..." پاشــــان لــــێم

زیـــده دەکـــرد: " ئەمـــن ئەحمقـــم!" ئەمـــن لە مانـــای ئەو وشـــانەی کە دەرمـــدەبڕین حـــاڵی نەبـــووم. تەنیـــا لە لەرزیـــنەوەی دەنگـــی خـــۆم لە هەوا ســـەیران وکەیفـــم دەکـــرد. ڕەنـــگە بـــۆ دەفـــع و کەمکـــردنەوەی تەنیـــایی خـــۆم لەگەڵ ســـێبەری خـــۆم دەئاخـــافتم! لەو کـــاتە شـــتێکی بـــاوەر پێنەکـــراوەم بێنـــی. دەرگـــا کـــراوە و ئەو لکـــاتە هـــات. دیـــاری دەدا کە جـــار وایە بە فکـــری مـــن دادێ. دیســـان جـــێگەی لە بەر چـــاوگرتن مانگـــار بـــوو! ئەو دەیزانـــی کە ئەمـــن زینـــدووم و کـــوێرەوەری دەکێشـــم و بە ســـەبرو لەســـەرەخۆ دەمـــرم. جـــێگەی پێـــزانین مانگـــار بـــوو. تەنیـــا دەمەویســـت بـــزانم ئـــاخۆ دەزانـــێ کە لە ســـۆنگەی ویبـــوو کە مـــن دەمـــردم! ئەگەر دیزانـــی ئەو چـــاخ ئاســـودەو خـــوش بەخـــت دەمـــردم. ئەو کـــات ئەمـــن خـــۆش بەختـــرین ئینســـانی ســـەر گـــۆی زەوی بـــووم. ئەم لکـــاتە کە پیـــی لە هـــۆدەکەم نا،لێکـــدانەوەو هـــزری خەراپـــم هەڵات. نـــازانم چ گزنگێـــک لە لەشـــی،لە بـــزوتنەوەی دە دەڵانـــدرا کە بە منـــی ئـــارامی دەبخشـــی! ئەم کەڕەت حـــاڵی باشـــتر بـــوو،قەڵەو جـــێ کەوتـــوو ببـــوو،لە مرۆڤـــانی ئەنگوجـــک خـــۆڵە پـــۆتینەو خۆڵەمێشـــی بڕیبـــۆوە، چـــونکە برۆکـــانی هەڵگرتبـــوو، خـــاڵی لە نـــاو دانابوو،وەســـمەی کێشـــابوو، ســـووراو ســـپیاوی کـــرد بـــوو. بە کـــورتی بە حەوت قەڵەم ڕازانەوە پێـــی لە هـــۆدەکەم نـــابوو. وەکـــوو ئەمە بـــوو کە لە ژیـــانی خـــۆی ڕازیـــیە و بـــێ ئەوە بـــیهەوی قـــامکی شـــادەی دەســـتی چـــۆپەی لە ســـەردەمی دانـــا. ئـــاخۆ ئەمە هەر ئەو ژنەکـــی زەریـــفە، هەر ئەوکیـــژی زەریـــف و مێهرەبـــان بـــوو کە جلـــووبەرگی ڕەشـــی چـــین چینـــی دەپۆشـــی و لە ڕەخ چەمـــی ســـورن پـــێکەوە گەمەی" ســـەرمامکمان" دەکـــرد؟ هەر ئەو کیـــژەی کە حـــاڵاتێکی ئـــازدو منـــداڵانەو ئامـــانەتی هەبـــوو و زەنـــدی پێـــی شـــاوەت

بزوینـــی لە ژێـــر داوێنـــی جلـــو بەرگـــی دیـــاری دەدا؟ هەتـــا ئێســـتا کە لە ویـــم دەڕوانـــی بە باشـــی تێـــنەدەگەیم. لەو چـــاخەدا دەتگـــوت پەردەیەک لە بەر چـــاوم کەوت! نـــازانم بـــۆ وەبیـــری مەڕەکـــانی قەراخ دووکـــانی قەســـاوی کەوتـــم! ئەو بـــۆ مـــن حـــوکمی لەتە گۆشـــتێکی بێـــڕەگ و چەوری پەیـــدا کـــرد بـــوو، خاســـییەتی دڵڕفێنـــی پێشـــووی بە تەواوی لە دەســـت دابـــوو. ژنێکـــی جێکەوتـــووی بە ویقـــارو مەتـــین و ســـەنگین و ڕەنگـــین بـــوو کە لە فکـــری ژیـــان دابـــوو،ژنێکی بە تەواوی مانـــا! خیزانـــی مـــن! بەتـــرس واهـــیمە بینـــیم کە خێـــزانم گەورەو ئاقـــڵ و خـــاوەن ئـــاوەز ببـــوو، لە حاڵێکـــدا بۆخـــۆم بە حـــاڵاتی منـــداڵی مـــابوومەوە. لە ڕاســـتیدا لە ڕوخســـاری وی، لە چاوەکـــانی خەجـــاڵەتم دەکێشـــا، ژنێـــک کە لە بـــن هەمـــووکەس دابـــوو جـــگە لە مـــن، و ئەمـــن تەنیـــا خـــۆم بە بیـــرەوەری خەیـــاڵی منـــداڵی وی دڵخۆشـــی دەداوە. ئەو کـــاتی کە چڕوچاوێـــک و بیچمێکـــی ئاســـایی و منـــدالانە، حـــاڵاتێکی جـــوقەواربڕین و چلیانـــدن تێپەڕیـــووی هەبـــوو، ئێســـتا شـــوێنی ددانـــی پیـــرە مێـــری پەکـــکەوتە لە پانـــایی ڕوخساری نەدەدیترا. نا،ئەوکەس نەبوو.

ئەو بەلاتـــاو پرســـیاری کـــرد کە" حاڵـــت چـــۆنە؟" ئەمـــن لە وڵامـــدا گـــوتم: " ئـــاخۆ ئەتـــۆ ئـــازانی؟ ئـــاخۆ هەر چـــی دڵـــت دەخـــوازێ و دەیەوێ نـــایکەی؟ چێـــت لە ســـاخ و ســـەلامەتی مـــن داوە؟" ئەو دەرگـــای پێکـــداداو ڕۆیـــی. بە هـــیچ جـــۆر نەگەڕاوەو چـــاو لە مـــن بکـــات. گۆیـــا ئەمـــن شـــیوەی ئاخـــافتن لە گەڵ ئینســـانەکانی دونیـــا، لەگەڵ ئینســـانەکانی زینـــدووم لە بیـــر کـــرد بـــوو! ئەو هەر ئەو ژنە کە فکـــرم دەکـــرد دوور لە هەر جـــۆرە ئیحساســـاتە،لەو ڕەفتـــاری مـــن دڵ ئـــێش بـــوو. چەنـــد جـــار

ویستم ڕابەم بڕۆم خۆم باوێمە سەر دەست و پێی، بگریم و داوای لێبوردنی لێبکەم، فکرم دەکردەوە ئەگەر توانیبوام، بگرییم ڕاحەت دەبووم ئاسوودە دەبووم. چەند دەقیقە، چەند کاتژمێر، یان چەند سەدە تێپەڕی؟ نازانم! وەکوو شێتم لێهاتبوو، لە دەردی خۆم کەیفم دەکرد،کەیفێکی باڵادەستی بەشەری،کەیفێک کە تەنیا ئەمن دەشێام بێکەم، خوداکانیش ئەگەر بوونیان بوایە، نەیاندەتوانی هەتا ئەو ڕادە کەیف بکەن و مەست و سەرخۆش بن. لەو کات دا بە چاتری و بەرزتری و لە پێشتری و لە سەرتری خۆم لە ئالۆجەلۆکان،لە سروشت، لە خواکان هەست پێکرد، ئەو خوایانی کە وەدیهینەری شاوەتی بەشەرن. ببووم بە خودایەک،لە خواش لە سەرتر بووم. چونکە جەرەیانێکی ئەبەدی و تاق و تەنیایم لە خۆمدا هەست پێدەکرد... بەڵام ئەو سەر لە نوێ گەڕاوە. ئەو هندەش کە فکرم بۆی دەچوو دڵ ڕەق نەبوو. رابوومە سەر پێ و دامنم ڕاموسی و لە حاڵی گریان و کۆخە خۆم خستە بەر پێی،ڕووم لە بەڵەکی لاقی وی خشاند وچەند جار بە ناوە حەسڵەکەی گاسم کرد. وەک ئەوە بوو کە ناوە راستییەکەی دەنگ و زەنگی تایبەتی هەبوو! بەڵام لە ناخی دڵم،لە قوڵایی قەڵبم دەمگوت:"لکاتە!" ماهیچەکانی پێی کە تامی کوڵمەی هاروێیان دەدا،تاڵ و سازگارو ئامال تفت بوو، لە ئامێزم گرت. ئەوندە گریام،نەمزانی چەندە کات تێپەڕ بوو! وەختێک وەخۆ هاتمەوە بینیم ئەو رۆیبوو. ڕەنگە ئەم چرکەیەکی نەکێشا بوو، کە هەموو ئەو کەیف ولاواندنەوانە و دەردەکانی بەشەریم لە خومدا هەست پێکردو هەر بەو حاڵات وەکوو ئەو وەختی کە

له بن دەموو دەزگای تریاک دادەنیشتم،وەکوو پیرەمێری پەک کەوتە کە لە ڕەخ شڕەو بڕەی خۆی دادەنیشێت،لە پێش چۆڵەچرا کە دووکەلی دەکرد مابوومەوە. لە سەر جێگای خۆم نەدەبزوتم، هەر بەمجۆرە بە دووکەڵی چۆڵەچرام دەڕوانی،دووکەڵەکان وەکوو بەفری ڕەش لە سەر دەست و ڕوخسارم دەنیشت. کاتێک کە دایانەکەم کاسکێک ئاشی جۆی و پڵاوی جوجەی بۆ هێنام لە بەر ترس و واهیمە هاواری کرد، کشاوە پشتەوەو سینی شامی لە دەست کەوت.

ئەمن خۆشحاڵ بووم کە هەر نەبێ هۆکاری ترساندنی وی بوم.. پاشان هەستامەوەو سەری فتیلەم بە مقست لێداو چوومە بەر ئاوێنە هیسەکەم لە چڕوو چاوم ئەستڕیەوە. چ بیچم و بەچکێکی ترسەنووک! بە قامکی لاقم پیلووی چاوم دەکێشا وبەردەدا، دەوم بەش دەکردەوە، گووپی خۆم فوو دەدا، بن ڕدینم هەڵدێناوە ولە دوو لاوە بامدەداو دەمپێچاوە. ئەداو ئەتوارم دەر دەهێنا. چرۆچاوی من ژێهاتوویی بۆ چ هەیکەل و بیجم و قەڵافەتێکی سەیرو سەمەرەو ترسەنۆکی هەبوو! گۆیا هەموو شکڵەکانی مەسخەرەو پێکەنین هێنەر،ترسەنۆک، و باوەڕ نەکراو کە لە دەروونی من شاراو بوو، بەم وەسیلە هەمووم بە ئاشکرا دەبینین. ئەو حاڵاتم لە خۆمدا دەناسی و هەستم پێدەکرد و لە عەینی حاڵێش دا بە بۆچوونی من مەسخەرە بوون. هەموو ئەو قیافانە لە من و ماڵی من بوون.

بیچم وپوتەراکەکانی ترسەنۆک و خوێنڕێژی و مەسخەرە کە بە ئامازەیەکی سەر قامکی، دەگۆڕان

و تەغیری شکڵیان دەدا. شکڵی پیرە مێرێکی قازی، شکڵی قەساو،شکڵی خێزانم، هەموو ئەوانەم لە خۆمدا دەبینێت.، دەتگوت دەنگ دانەوەو ڕەنگدانەوەی وەدەرکەوتنی هەموو ئەوان لە من دابووە! هەموو ئەو قیافانە لە مندا بووە، بەڵام هیچ کام لە ئەوان ماڵی من نەبوو.  ئاخۆ حاڵاتی ڕوخساری من، بە هۆی دنە دانێکی نەناسراو، بە هۆی واز وازی بوون، تیکەڵای و ئومیدەکانی ئیرسی دورست  نەببوو؟ و ئەمن کە لە ناکاو ئەو بارە قورسەی ئیرسی بووم، بە  هۆی پێحەسانێکی شێتانە، بێ ئیرادە فکرم ئاگادار نەبوو، کە ئەم حاڵاتەم لە بیچم رابگرێ؟ ڕەنگە تەنیا لە کاتی مەرگ بیچمم لە زنجیری ئەو واسواسیە ئازاد دەبوو، حاڵاتی سروشتی کە دەبوا هەیبوایە، وەخۆی دەگرت! بەڵام ئاخۆ لە حاڵاتی دوایشدا حاڵاتێک کە دائیم ئیرادەی گەمە کەری منی لە سەر بیچمی من هەڵقەند بوو، نیشانەی خۆی توندترو قوڵتر نەدەهیشتەوە؟بە کورتی تێگەیم کە چ کارێک لە دەست من دەهات! بە لێهاتوویی و ژیهاتوویی خۆم حاڵیبووم. جارێک دەستم بە پێکەنین کرد، چ پێکەنینەکی کڕاوو بەلاتاوو پلار و ترسەنۆک بوو! بە جۆرێک کە موو لە لەشم راست بوونەوە. چونکە دەنگی خۆم نەدەناسیەوە. وەکوو دەنگێکی دەرەکی، پێکەنینەک کە زوربەی لە بن قڕقڕۆچکەم گرێوگۆڵی کرد بوو،لە بن گوێچکەم ئاوازەی دابۆوە، و لە گوێمدا گاسی کرد. ئەو کات کۆخەم دەستی پێکرد، لەتێک لە خڵتی خوێناویم، لەتێک لە جەرگم کەوتە سەر ئاوێنە. بە سەری قامکم ئەوم لە سەر ئاوێنە کێشاخوار. کاتێک گەڕامەوە بینیم نەنکی خۆشەویستم بەڕەنگ پەڕیوەی مانگەشەو،

ســـــەروکەزی شـــــپڕێوو ئــــاڵۆزاو چـــــاوی کەم ســــۆمای، بە تـــرس و  واهـــیمە کاســـکێک ئـــاوی جـــۆی لەو ئاشـــەی کە بـــۆی هێنـــا بـــووم و لە دەســـتی کەتبـــوو ڕژابـــوو، بە مـــاتی چـــــاوی لە مـــــن بـــــڕی. ئەمــــن دەســـــتەکانم لەبەر چـــــاوم ڕاگرت لە پشت پردەی خوڵوەتی خۆم حاشاردا.

کاتێـــک کە هـــاتم بـــخەوم، دەورەی ســـــەرم ئـــاڵقەیەکی ئـــاگرین فشـــاری دەدا.  بـــۆنێکی تونـــدو تیـــژی شـــاوەت بزوێنـــی ڕۆنـــی ســـەندەڵ کە لە چـــۆڵە چـــرام کـــرد بـــوو لە کەپـــۆم دەگەڕا. بـــۆنی ماهیچەکـــانی پێـــی خێزانمـــی دەدا و تـــاموو چیـــژی کـــوڵمەی هـــاروێ  تـــاڵوو نەرم وعەلیمـــی لە دەمـــم دابـــوو. بە دەســـتم لەشـــم دا دەمـــاڵی و لە خەیاڵمـــدا ئەنـــدامی لەشـــم- ڕان،بەلکـــی لاق، باســـک و هەمـــوو ئەوانەم- لە گەڵ ئەنـــدامەکانی لەشـــی خیـــزانم لە بەر یەک ڕادەگـــــرتن و هەڵدەســـــەنگاندو ســـــەنگ و ســـووکم دەکـــرد. خەتـــی ڕان و ســـمت،گەرمای لەشـــی خێزانم،ئەمـــانە ســـەر لە نـــوێ دەهـــاتنەوە بەر چـــاوم. لە خســـتنە بەر چـــاو گەلێـــک قەوی تـــرو بە تابشـــت تـــر بـــوو، چـــونکە ڕوخســـار ئاتـــاجیەکی هەبـــوو پێحەســـیام کە دەمەوێ لەشـــی وی نزیـــک لە مـــن بێـــت. بـــزوتنەوەیەک، بڕیارێـــک بـــۆ لە نـــاو بردنـــی ئەو واسواســـیەی شـــاوەت بـــزوێن بەس بـــوو. بەڵام ئـــاو ئالقـــانەی ئـــاگرین دەوری ســـەرم بە ڕادەیەک تەنـــگ و ســـوزیاگ بـــوو کە بە تەواوی لە دەریـــایەکی نـــاڕوون و بوڵێـــڵ و تـــێکەڵ پـــێکەڵ لە گەڵ هەیکەڵەکانی ترسەنۆکوو قوم بووم.

هێچتـــا هەوا تاریـــک بـــوو. لە دەنگـــی دەســـتەیەک پاســـەوانی مەســـت وەخەبەر هـــاتم کە لە نـــاو کـــوچە تێـــدەپەڕین، جنێـــوی پیســـیان پێکـــدەدان و پـــێکەوە ئەو گۆرانیەیـــان دەگـــوت: وەرە بـــا بچـــین مەی بخـــۆین،

شەڕابی مولکی ڕەی بخۆین، ئێستا نەخۆین کەنگێ بخۆین؟".

وەبیرم هاتەوە، نا،جارێک بە من ئیلهام کرا،کە لە خەڵوەتی هۆدەی ماڵەکەم، شووشە شەڕابێکم هەیە. شەڕابێکی ژەهراوی، ژەهری ددانی ناگ"ماری کوبڕای هندی" لە ویدا تێکەڵکرا بوو و بە چۆڕێک خواردنەوە، لە وی هەموو کامووسەکان ژیان نیست و نابوود دەبوو، لە ناو دەچوو. بەڵام ئەو لکاتە...؟ ئەم وشە ئەمنی زۆرتر بە وی بە تەماح و بەر چاو برسی دەکرد، زۆرتر ئەوی سەر حاڵ گەرم وگوڕ بە من دەخستە ڕوو نیشاندەدا. چ باشتر لەمە دەمتوانی خەیاڵ بکەم؟ پیاڵەیەک لەو شەڕابەم بە وی دابوایە، پیاڵەیەک بۆ خۆم وەسەرم کردبوایە. ئەو چاخ لە ناو تێکترنجان وتێکچوون و هەژان، پێکەوە دەمردین.

ئەوین چییە؟ بۆ هەموو ئالۆوجەلۆکان،بێئاپڕویی، بێویقاری و،هەرزە بوونێکی ئامانەتییە، ئەوینی ئالۆوجەلۆکان دەبێت لە دەستە دەستەو چین و گروپ کردنی ڕووسپی و ئەو ئیسلاحات ناحەزو ناشیرین و ناڵەبار کە لە دونیای مەستی و سەر خۆشی و هوشیاری دوو پات دەبێتەوە بدۆزیەوە. بەڵام ئەوین سەبارەت بە وی بۆ من شتێکی دیکە بوو. ئەمە ڕاستە ئەمن ئەوم لە قەدیمەوە دەناسی: چاوەکانی شیرین خێلی، سەر سورماوی،دەمی تەنگ و نیوە کراوەی،دەنگی کپ و ئارامی،هەموو ئەوانە بۆ من تەژی لە بیرەڤانی دوورو درێژ و بە خەم و کول و دەردو حەسرەت بوو، و ئەمن لەو هەموانە ئەوەهەی کە لێی بێبەش و مەحرووم مابووم، شتێک پەیوەندی

بەخۆمەوە هەبوو، کە لە منیان ئەستاند بوو، لێیدەگەڕام.

ئاخۆ بۆ دایم و دەرهەم ئەمنیان بێبەش و مەحڕووم کرد بوو؟ بۆ ئەمە بوو کە هستی ترسەنۆکتر لە من دا سەری هەڵدا بوو. لەزەتێکی دیکە کە بۆ ئەوینی ناهومێدی خۆم هەست پێدە کرد، بۆم ببوو جۆرە واسواسیەک. نازانم بۆ بە بیری مرۆڤی قەساوی ڕوو بە ڕووی دربیچەی هۆدەم بووم، کە باسکی هەڵدەکردن"بسم اللەی" دەگوت و گۆشتەکانی دەبڕین. حاڵ و چلۆنایەتی وی هەمیشە لە بەر چاوم بوو.

لە ئاکامدا ئەمن بڕیارم گرت، بڕیارێکی ترسەنۆک. لە ناو جێووبان ڕابووم،باسکم هەڵماڵین و کێردی دەسکە ئیسکم کە لە بن باڵنج نابوو هەڵگرت. پشتم کوڕ کردەوە و عەبایەکی زەردیشم بە سەر شانم دادا، پاشان سەرو ڕووی خۆم بە شاڵگەردن پێچا،هەستم پێکرد لە عەینی حاڵدا حاڵاتێکی تێکەڵاو، لە گەل ورەی قەساو ئەو پیاوە پیرە پەککەوتە لە من دا پەیدابوو. پاشان ورده وردەو سەبر سەبر بۆ لای هۆدەی خێزانم چووم. هۆدەکەی تاریک بوو،دەرگام سەبرۆکە کردەوە،وەکوو ئەمە بوو کە خەو دەبینی،بە دەنگی بەرز لە گەڵ خۆی قسە دەکرد: "شاڵگەردنت بکەوە" چوومە ناو جێووبان،سەرم لە پێش هەناسەی گەرم و نەرمی وی ڕاگرت. چ گەرمایەکی شیرین و زیندووکەری هەبوو! بۆچوونم وابوو ئەگەر ئەو گەرماو بۆن بەرامەیەم سەردەمێک هەڵکێشابوایە، سەر لە نوێ زیندوو دەبۆمەوە. ئۆ! چ ڕادە وەخت بوو کە ئەمن فکرم لێدەکرد هاناسەی هەموو کەس دەبێ وەکوو

هەناســـــەی مـــــن داغ و ســـــۆزیاگ بێـــــت. بە وردی لێـــــی خوردبـــــوومەوە کە ببیـــــنم ئـــــاخۆ لە هـــــۆدەی وی مرۆڤێکـــــی دیـــــکە بـــــوونی هەیە؟ یـــــانی: لەو فاســـــقانەی وی، کەســـــێک لە وێ بـــــیەی هەیە یـــــان نـــــا! بەڵام ئەو تەنیـــــا بـــــوو. تـــێگەیم هەر چـــــی وەپـــاڵ ویـــم دەدا تـــۆمەت و ئیفتـــڕاو بوهتـــــان بـــــووە. لە کـــــوێ مەحلـــــوومە ژنە هەر کچێکـــــی ســـــەر بە مۆرنەبـــــوو! لە ســـــەر جەم خەیـــــاڵاتی نـــــاڕوون و بوڵێـــــــڵ ســـــەبارەت بە وی شـــــــەرمەندە بـــــــووم. ئەو ئیحساســـــە دەقـــــیقەیەک زێـــــدە درێـــــژەی نەبوو،چـــــونکە لەو کـــــاتە وەختێـــــک لە دەرەوە دەنگـــــی پشـــــمین هـــــات و پێکەنینەکـــــی کـــــپ و مەســـــخەرە کە مـــــووی لە لەشـــــی مـــــرۆڤ راســـــت دەکـــــردەوە بیســـــتم. ئەو دەنـــــگە هەمـــــوو ڕەگەکـــــانی لەشـــــمی کێشـــــا دەر. ئەگەر ئەو پشـــــمین و پێکەنیـــــــنەم نەبیســـــــتبوایە، ئەگەر ئەو ســـــــەبرە نەهـــــاتبوایە، هەر بەو جـــــۆرەی کە بڕیـــــارم گرتبوو،هەمـــــوو گۆشـــــتی لەشـــــی وێـــــم پشـــــک پشـــــک دەکـــــرد و دەمـــــدا بە قەســـــاوی بەر دەرگـــــای ماڵەمـــــان هەتـــــا بە خەڵـــــک بفرۆشـــــێ، وبـــــۆ خـــــۆم پشـــــکێک لە گۆشـــــتی ڕانـــــی وی وەکـــــوو نەزر دەدا بە پیـــــرە مێـــــری قورئـــــان خـــــوێن،و ســـــبەینەکەی بە ویـــــم دەگـــــوت: ئەمـــــن دوێنـــــێ! ئەو گۆشـــــتەی کە دوێنـــــێ خـــــواردت مـــــاڵی کـــــێ بـــــوو؟ ئەگەر ئەو پێنەکەنیبـــــوایە، دەبـــــوایە ئەو کـــــارم بە شـــــەو کـــــرد بـــــوایە کە چـــــاوم بە چـــــاوی لکـــــاتە نەدەکەوت،چـــــونکە لە حـــــاڵاتی چاوەکـــــانی وی خەجـــــاڵەتم دەکێشـــــا. ئەمنـــــی ســـــەر کـــــۆنە دەکـــــرد. ســـــەر ئەنجـــــام لە ڕەخ جێووبـــــانی لەتە پـــــارچەیەک کە پێشـــــی لاقـــــی گرتبـــــووم هەڵگـــــرتەوە و بـــــازرەو ســـــام ڕێنیشتوو وەدەرکەوتم.

کاردەکەی دەست ئیسکم،بە هەسانی تیژ کرد، چونکە هەموو هزروفکری خوێنڕێژی ئەو کاردە بۆی وەدیهێنا بووم. ئەم کێردەو وەکوو کێردی مرۆڤی قەساوبوو لە خۆم دوور کردو لەو لام دانا. کە بۆ هۆدەکەم گەڕامەوە ،لە بەر شەبەقی چۆڵە چرا بینیم کە کراسی ویم هەڵگرتووە، کراسێکی چڵکن کە لە سەر گۆشتی لەشی وی بوو، کراسی ئاوریشمی نەرم کاری هند کە بۆنی لەشی وی، بۆنی عەتری موگرا دەدا،و لە بزوتنەوەی لەشی،لە بیەی وی، لەو کراسە دا ما بۆو. ئەوم بۆن کرد، لە ناو لاقانم دانا و نووستم. چ شەوێک ئەوها بەو ئاسودەییی نەنووستبووم. سبەی زوو لە دەنگی هەراو هوریای خێزانم لە خەو ڕابووم، بیستم کە لە مەڕ ون بوونی کراسی وەرێخستبوو، چەند پاتی دەکردەوە"کراسیکی نوێ...!" لە حاڵێکدا سەری قولی دڕابوو. بەڵام ئەگەر خوینیش وەرێکەوتبوایە، ئەمن حازر نەبووم کراسەکە بدەمەوە. ئاخۆ ئەمن حەقی کراسە کۆنێکی خیزانم نەبوو؟

نەنکی خۆشەویستم کە شیری کەرێ و هەنگوین و نانی تافتوونی بۆ هێنام، کاردێکی دەسک ئێسکیشی لە سەر سینی چێشتی من دانابوو، گوتی: ئەوی لە ناو خرتووپرتی پیرە مێری دیوە و کڕیویتی. دووایی برۆکانی هەڵتەکاندو گوتی: " خوا کرد بوای بە دەردی خوار بوام" . ئەمن گزلشکم هەڵگرت و چاوم لێکرد،هەر ئەو کزلێکی خۆم بوو. دوایی نەنە جوون وەکوو سکاڵاکەر و دڵ ئێش گوتی: بەڵێ! کیژەکەم- یانی لکاتە- بەرەبەیانی هاتووە دەڵێت کراسی من دوێشەو ئەتۆ دزیوتە. ئەمن نامەوێ شوڵەو زمەی

ئێــوه بــم! بەڵام دوێنــی خێزانــت پنــۆكی خــۆینی دیبــوو....
ئــیمه دەمــانزانی كه منــداڵ... بۆخــۆی دەیگــوت: له
ناوحەمــام منــدالی وەزگــی كەوتــووه، شــەو دەچــووم
كەمەری مشــتووماڵ بــدەم بینــیم كه له ســەر باســكی
چەنــد شــوێن شــین و ڕەش ببــوو، بەمنــی نیشــاندا
وگــوتی چــوومه ژێــر زەمین،تونــدیان قــورینجیم." دوو
بــارەگوتی: " ئــاخۆ دەت زانــی خێزانــت منــداڵی وەزگــی
كەوتــووه؟ ئەمــن پێكەنــیم وگــوتم: "ڕەنــگه شــكلی
منــاڵەكه وەک شــكڵی پیــره مێــر بچێــت،پیره میــری
قورئان خوێن، ڕەنگه ڕووبەڕووی وی بزوتبێت!".

دوایــی نەنەجــوون، به حــاڵاتی ڕەنــگ بزركــاو، له دەركه
وەدەر كەوت. وەكــوو ئەمه چــاوەڕوانی وڵام نەبێــت،
ئەمــن دەســتووجێ ڕابــووم، گزلیشــكی دەســك ئێســكم
به دەســتی لەرزۆک بــرد له خڵــوەتی هــۆدە له نــاو
مجری دانا،و دەرگەم گاڵه كرد.

نــا،هیچ كــات مــومكین نەبــوو كه منــاڵەكه له ڕووبه ڕووی
مــن جــۆڵابێتەوە. بێگومــان له بەرامــبەر پیــره مێــری
پەككەوته جووڵابۆوە!

پــاش نیــوەڕۆ دەركەی هــۆدەم كراوه،بــرای گچــكەی-
بــرای كچــكەكەی ئەو لكــاته- له حاڵێكــدا نێنــووكی
دەجــووت هــاته ژوور. هەر كەس ئەوانــی دەدیــت
دەســتووجێ تێــدەگەیی كه خوشــک و بــران. ئەونــده
ویكتــر دەچــوون دەتگــوت ســێوەكن لەت كــراون. دەمــی
گچكه،تەنــگ، لێــوی گۆشــتاڵووی تەڕو شــاوەتی،
پێلوەكــانی خــوارەوه بــوو خومــار، چاوەكــانی شــیرین
خێــل، گۆناكــانی دەرپەڕیــوو. موەكــانی خورمــائی و نــا

تەکوز و ڕوخساری ئەسمەر بوو. دورست وەک ئەو لکاتە بوو و لەتێک لە گیانی شەیتانی وی هەبوو. لەو ڕوخسارانەی تورکمەنی بێ ئیحساس و هەست و بێگیان کە بە لێهاتووی پەرەچەنگ لە گەڵ ژیان سازدرا بوو. قیافەیەک کە هەر کاری بۆ بەردەوامبوونی ژیان بە ڕەوا دەزانی،وەکوو ئەمە سروشت پێشتر پێشبینی کرد بوو،وەکوو وی ڕەچەڵەکی ئەوان زێدەتر لە ژێر خۆرو باران ژیا بوو و لە گەڵ سروشت جەنگیبوو و نەک تەنیا شکڵ و بیچمی خۆیان بەگۆڕانکاریەک بە ئەوان دابوو، بەڵکوو لە خۆ ڕاگری،لە شاوەت و ئێرەیی لە تەماح و برسیایەتی خۆیان بە ئەوان بەخشیبوو.

تامی زارم دەزانی،وەکوو تامی هاروێ تاڵوو نەرم بوو. کە واردی هۆدە بوو بە چاوەکانی واق وڕماوی تورکمەنی چاوی لە من کرد وگوتی: " شاگیان،دەڵێت حەکیم باشی گوتوویە ئەتۆ دەمری، لە شەڕرت خەلاس دەبم. مەگین مرۆڤ چلۆن دەمرێ؟" ئەمن گوتم" پێی بڵێ ئەمن زۆر لەمێژە مردووم".

شاگیان گوتی: ئەگەر منداڵەکەم لە بەر نەچووبوایە هەموو، ماڵ ئی من دەبوو". ئەمن بێ ئەوەی بمهەوێ دەستم بە پێکەنین کرد،پێکەنینەکە ویشک و بە لاتاو بوو کە مووی لە لەشی مرۆڤ ڕاست دەکردەوە،بە جۆرێک کە دەنگی خۆم نەدەناسی. کوریژگە لە ماڵ دەرپەڕی. لەم وەختە تێگەیم کە بۆچ مرۆڤی قەساو لە ڕووی کەیف کێردی دەسک ئێسکی بە ڕانی مەڕەکان خاوێن دەکردەوە! کەیفی بڕینی گۆشتی نەرمەی بێڕەگ و چەورایی کە لە ناو وی خوێنی مردوو، لەتە خوێن وەکوو قوڕ کۆ ببۆوە و لە

خڕخـــڕوکەی پەزەکـــان دڵـــۆپ دڵـــۆپ خوێنـــاو دەتکـــا ســـەر هەرد. ســـــەگەکی زەرد لە پــــێش قەســـــاوخانە، چــــاوی لە کەلـــــلەی پڕیــــوەی گـــــایەک کە لە ســـــەر هەرد کەوتبــــوو دەکـــــرد، هەر وا ســــەری هەمــــوو مەڕەکــــان، بەو چــــاوانە، کە چۆکێــــک تــــۆزی مردنیــــان لە ســــەر کەوتبــــوو، ئەوانــــیش دیبوویان، ئەوانیش دەیانزانی!

لە ئاکامـــــدا حـــــالێبووم کە بــــوومە بە نــــیمچە خــــودایەک،لە ســــەرووی هەمــــوو ئاتاجیەکــــانی بــــێ بــــایەخ و گچــــکەی خەڵــــک بــــووم، مەســــەلەی ئەزەلــــی و ئەبەدیــــم لە خۆمــــدا هەست پێدە کرد.

ئـــــاخیرەت و پاشـــــەڕۆژوو دوا ڕۆژ، یــــان هەمیشـــــەیی بــــوون چییە؟بــــۆ مـــــن لە نـــــاو نەچــــوون و نەپســــــانەوە و بەردەوامـــــــی، بریتـــــــی لەمە بــــوو کە لە ڕەخ چەمـــــــی ســــــــوورن،لە گەڵ ئەو لکـــــــاتە گەمەی "ســــــــەرمامەک "بـــکەم و تەنیـــا چـــرکەیەک چاوەکـــانم لە ســـەر یەک دانـــیم و سەرم لە ناو داوێێنی وی وەشارمەوە.

لە ناکـــاو ئەو بۆچـــوونە لە مـــن دا گـــوورا کە لە گەل خـــۆم قســـە دەکـــرد، ئەویـــش بە شـــێیوەکی ئـــاوارەیی و نـــامۆیی و کەس نەناســــــــی و هەتـــــــڵەو هەڵــــــــوەدایی و تەرەو تەوەلایـــی و دەر کـــراوی. ویســـــتم لە گەڵ خـــــۆم بـــــاخۆم، بەڵام لێوەکــــانی بە ڕادەیەک قــــورس ببــــوون کە تەنــــانەت ئامـــادەو حـــازر بـــۆ کەمتـــرین بـــزوتن نەبـــوو. بەڵام بـــێ ئەوی لێوەکـــانم بجـــۆڵینەوە و ببـــزوون یـــان دەنگـــی خـــۆم ببیســـم، هەستم پێکرد کە لە گەڵ خۆم قسە دەکەم.

لەم هـــۆدە دا کە وەکـــوو قەبـــر، هەر چـــرکە تەنـــگ تـــرو تـــاریکتر دەبوو،شـــــەو بە ســـــێبەرەکانی ترســـــێنەرو تـــۆقێنەر، دەورەی منـــی گەمـــارۆ دا بـــوو. لەبەر چـــۆڵەچرا

کە دووکەڵی دەکرد بە پاڵتوو عەبایەک کە لە خۆم وەرپێچابوو وشاڵگەردنم بەستبوو بە شێوەیەکی بێدەنگ سێبەرم وەدیوار کەوتبوو. نیسێکەم ڕاستەقینەتر لە خۆم بوو. گۆیا پیرە مێری خنزرپنزری،مرۆڤی قەساو،نەنکی خۆشەویستم و خێزانم لکاتە هەموو سێبەری من بوون، ئەو سێبەرانەی کە لە ناویاندا زیندانی و حەپس بووم. لەم چاخە ببووم بە کوندێک، بەڵام گمەگمم لە گەرووما حاسێ ببوو،بە شکڵی پنۆکی خوین، ئەوانم تف دەکردوە. ڕەنگە بایەقوشیش نەخۆشی هەیە، کە وەکوو من فکر دەکاتەوە! سێبەرم لە سەر دیوار ببوو بە کوند و بە شێوەیەکی خۆ خوار کردنەوە، نوسینەکانی منی بە وردی دەخوێندەوە. بێگومان ئەو باش تێدەگەیی، تەنیا ئەو دەیتوانی بفامێت. بە سیلەی چاوم کە لە سێبەری خۆم دەڕوانی، دەترسام.

شەوێکی بێدەنگ و کپ و تاریک، وەکوو شەوێک کە هەموو ژیانی من داگرتبوو. بە شکڵ و شەمایلی ترسەنۆک کە لە دەرو دیوار، لە پشت پەردە، گەمەیان بە من دەکرد ولاسایان دەکردمەوە. جار وەبوو هۆدەکەم ئەوندە تەنگ دەبوو وەکوو وەی کە لە تابووت دا نوستبم. لاجانگەکانم دەسوتانەوە، دەمارە هەستەکانم بۆ کەمترین جوڵە حازر نەبوون. قورسایەک لە سەر سینگم ئەمنی فشار دەدا و ڕێکدەکوشی، وەکوو بارستایی ئەو جەندەکەو کەلەشانەی کە بە سەرپالانی پشتی ئەسپەکان ڕەشی کز دادەکەن وادێنن و تەحویلی قەساوی دەدەن.

مردن لە سەرە خۆو گۆرانی خۆی بە نارە نار دەست پێدە کرد. وەکوو کەسێکی لاڵ، کە ناچارە هەر وەشەیەک دوو پات کاتەوە و کاتێک کە کەسێک شێعرێک تەواو دەکات، دیسان لە سەررا دەستی پێدەکاتەوە. دەنگەکەی وەکوو لەرانەوەی دەنگی مشار لە سەر گۆشتی لەشی تێک و چڕژ، بۆ قەڵاشتن، دوایی دەرزوو قەڵشت و تیک پێدان، دادیدەقەڵێشیت،هاواری دەکرد لە ناکاو کپ و بیدەنگ دەبوو.

هیچتا چاوەکانم نەچووبوونە خەو، کە دەستەیەک پاسەوانی مەست لە پشت هۆدەکەم تێدەپەڕین و پێکەوە ئەم گۆرانیان دەگوت: " وەرە بڕۆین تامەی بخۆین،شەڕابی مولکی ڕەی بخۆین، ئێستا نەخۆین کەنگێ بخۆین.؟". بە خۆم گوت: لە حاڵێکدا کە سەر ئەنجام ڕۆژێک وەدەستی دارۆغە دەکەوم. لە ناکاو قوەتێکی بالا دەستی بەشەریم لە خۆمدا هەست پیکرد، نێوچاوانم فێنک بۆوە، ڕابووم عەبای زەردەم لە سەر شانم فڕیدا، شاڵگەردنم سەر لە نوی لە دەوری سەرم هەڵاند،خۆم کۆڕ کردەوە، چووم کێردی دەسک ئێسکم کە لە خلوەتی لە ناو مجری دانا بوو، هێنا دەر،سەبر سەبر بۆ لای هۆدەی ئەو لکاتە ڕۆیشتم. کە گەیمە بەردەرکە، هۆدەکە لە تاریکایەکی بوڵیڵ و ئەنگوست لە چاودا نوقم ببوو. بە وردی گوێچکەم هەڵخست،دەنگێکم بیست کە دەیگوت: "هاتی؟ شاڵگەردەنت بکەوە!"

دەنگەکەی زەنگێکی شیرین بوو،وەکوو سەردەمی منالی لێهاتبوو، وەکوو نارە نارێک کە بێ بەرپرسی لە خەو دەیکەن. ئەمن ئەم دەنگەم پێشتر لە خەوێکی

قـــووڵ و گـــران بیســـتبوو. ئـــاخۆ خەوی دەبینـــی؟ دەنگـــی وکـــپ و گەورە وەکـــوو دەنگـــی کێـــژۆڵەیەک ببـــوو کە لە قەراخ چەمـــــی ســـــوورن لە گەڵ مـــــن (گەمەی ســـەرمامەک)ی دەکـــرد. بەڕێـــک ڕاوەســـتام ســـەر لە نـــوێ گـــــویم لێبـــــوو کە گـــــوتی: "وەرە ژوور،شـــــاڵگەردەنت بکەوە!".

ئەمـــــن لە ســـــەرەخۆ لە تـــارێکی دا چـــــوومە هـــــۆدەکە، عەبـــاو شـــــاڵگەردنم دەرهێنـــــان، خـــــۆم ڕووت کـــــردەوە، بەڵام نـــازانم بـــۆچ بەم جـــۆرە کە کێـــردی دەســـک ئیســـکم لە دەســـتدا بـــوو لە نـــاو نـــوێن خـــزام؟ گەرمـــایی جیـــوو بـــانەکەی وەکـــوو ئەمە بـــوو کە گیـــانێکی تـــازەی بە جەســـتەی مـــن پـڤـــی. دوایـــی لەشـــی شـــیرین،نمدارو خـــۆش گەرمـــایی ئەوی بە بیـــری ئەو کیـــژی ڕەنـــگ پەڕیـــــوەی کـــــز، کە چاوەکـــــانی گەورەو بێتـــــاوانی تـــورکمەنی هەبـــوو لە قەراخ چەمـــی ســـــوورن لە گەڵ مـــن گەمەی ســـــەرمامەکی دەکـــرد لە ئـــامێز گـــرت. نـــا،وەکوو دەعبـــایەکی دڕنـــدەو وەحشـــی و برســـی هێرشـــم کـــردە ســـەر و لە قـــوولایی دڵمـــدا پـــێم نـــاخۆش و دڵنەخـــواز بـــوو. وام هـــاتە بەر چـــاو کە هەســـت و ئەویـــن وغەرز پـــێکەوە بـــوو. لەشـــی مـــانگە شـــەوو فێنکـــی وی، لەشـــی خێـــزانم"مارنـــاگ" کە لە دەورەی نێچیـــری خـــۆی دەهاڵا،لێـــک بـــۆوە و ئەمنـــی لە نـــاو خۆیـــدا حەپـــس کـــرد. عەتـــری ســـینگی مەســـت هێـــنەر بـــوو. گۆشـــتی باســـــکەکانی نەرمـــــی کە لە دەورەی گەردنـــــم هـــــاڵا گەرمـــــایەکی جـــــوان و نەرم و خۆشـــــکۆکی هەبـــــوو. لەم چـــرکە تاســـەو ئـــارەزووم دەکـــرد کە ژیـــانم دوایـــی پـــێ هـــاتبوایە، چـــونکە لەم دەقـــیقەدا غەرز کیـــنەو دڵ ئیشـــی کە ســـەبارەت بە ویـــم هەبـــوو لە نـــاوچوو بـــوو حەولمـــدەدا

که پێشی گریانی خۆم بگرم. بێ ئەوەی ئاگام له خۆم بێت وەکوو موحیبەتی گیا، لاقەکانی له پشت پێیەکانی من قفڵ بوو و دەستەکانی له پشت گەردنم چەسپان. ئەمن تین ئەو گۆشتی شیرینی و تەڕو تازەیەم هەست دەکرد، تەواوی زەڕرە زەڕرەی لەشی سوزیاگم، ئەم تینەی تێده گەڕا و دەنۆشی. هەستم دەکرد که ئەمنی وەکوو پارو له دەرونی خۆیدا دەکێشا.

ئیحساسی ترس وکەیف تێکەڵی یەکتر ببوو. دەمی تام وچێژی هارویێی دەدا و تفت و مزر بوو. له ناو ئەو تەوژمە شیرینە ئارەقەم دەڕژاند و له خۆم بێخەبەر ببووم. چونکه لەشم ،هەموو ئەندامم بە منیان فەرمانی حوکم ڕانی دەدا. پیرۆزیوو سەر کەوتنی خۆیان به دەنگی بەرز ڕادەگەیاند،ئەمن مەحکووم و هەژار لەو دونیای بێ دوایین له بەرامبەر ئەو شەپۆلانەی هەواو هەوس سەری تەسلیم وخۆ بەدەستەوەدانم دەهێناخوارو کڕنۆشم دەبرد. تاڵەمووەکانی وی که بۆنی عەتری نێوکی ئاسکیان دەدا کەوتبوو سەر چرۆچاوم و پێوە نووسا بوو هاوارو پەریشانی ودڵەخۆرپەو خۆشی و شایی له ناخی لەشم دەهاتەدەر. له ناکاو هەستم پێکرد که ئەو لێوی منی به توندی گەست،بە جۆرێک که له ناوەڕاست دڕیا. ئاخۆ قامکی خۆی ئەو جۆرە دەجووت، یاکوو تێدەگەیی ئەمن پێرەمێری لێو شەکەر نیم؟ ویستم خۆم نەجات بدەم بەڵام هەتا کەمترین جوڵانەوە بۆم له کردن نەهاتوو نامومکین بوو. هەر چەند حەولوو تەقەلام کرد بێفایده و چوونه بوو. گۆشتی لەشی ئێمەیان پێکەوە لەحیم کرد بوو جۆش

دابۆوە. فکرم کرد شێت بووە. لەو کێشمە کێشمەدا بێ ئەوە بمهەوێ دەستم ڕاوەشاند هەستم پێکرد ئەو کێردەی کە لە دەستم دابوو وەشوێنکی لەشی وی کەوت و چوو خوار. تڕایەکی گەرمی بە چڕو چاوم دا ڕژاند. ئەو هاواری کرد و ئەمنی بەرهەڵڵا کرد. تەڕاییەکی گەرم کە پڕی دەستم ببوو هەڵاتم و کێردەکەم فڕیدا. دەستی ئازاد بووم لە لەشی وی دا بە تەوای ساردبوو. ئەو مردبوو.

لەو نێوە دا وەکۆخە کەوتم، بەڵام ئەمە کۆخە نەبوو، دەنگی ویشک و لاتاو بوو کە مووی لە لەشی مرۆڤ قیت دەکردەوە. ئەمن توقیوو، زاتچووگ و سام ڕێنیشتوو، عەبام بە سەر شانم داداو بۆ هۆدەی خۆم ڕۆیشتم. لە بەر شەبەقی ڕووناکایی چۆڵەچرا مستم کردەوە، بینیم کە چاوی وی لە ناو دەستم دابوو،و تەواوی لەشم خوێناوی ببوو.

چوومە پێش ئاوێنە بەڵام لە هەیبەتی ترسان دەستەکانم لە بەر چاوم گرت. بینیم وەکوو- نا هەر لە بنەڕەت- ببووم بە پیرە مێرەکی پەککەوتە. مووەکانی سەرو ڕدێنم وەکوو مووەکانی سەرو ڕدینی کەسێک بوو کە زیندو لە هۆدە وەدەرکەوێ کە مارێکی مارناگ دەباڵ کرابێ، هەموو سپی ببوو. لێوم وەکوو پێرە مێر دڕیابوو، چاوەکانم بێ مژوڵک بوو، چەنگێک مووی سپی لە سینگم هاتبوو دەر وگیانێکی تازە چوو بوو ناو لەشی من. لە بنیات دا جۆرێکی دیکەم فکر دەکردەوە، جۆریکی دیکەم هەست دەکرد نەمدەتوانی خۆم لە دەست وی، لە دەست دێوێک کە لە مندا وەخەبەر هاتبوو نەجات بدەم. هەر بەم جۆرە کە دەستم لە پیش چاوم ڕاگرتبوو لە خۆرا دەستم بە

پێکەنین کرد، پێکەنێنکی توندتر لە هەوەل کە جەستەی منی وەلەرزین خست. پێکەنێکی قووڵ کە مەعلووم نەبوو لە کام بیری بزر بووی لەشم دێتەدەر! پێکەنینێکی بەتاڵ کە تەنیا لە گەرومدا پێچی دەخوارد و لە ناوەکی بەتاڵ دەهاتەدەر. ئەمن بووم بە پێرەمێرێکی پەککەوتە.

ڕێکەوت ٧-١٠ دەستم بەوەرگێڕانی کرد لە ٢١-١٠ی ٢٠١٢ تەواو بوو، یانی بە دوو حەوتوو( ١٤) ڕۆژ،وەرمگێڕاوە. حامیدڕەشیدی زەرزا....